زێمارێن چیای، زێمارەکا خەمگینە
وەکی پاییزەکا، بارانێ رۆیبێن وێ بێن سۆر نەشیشتین
وەکی زڤستانەکا، بەفری کەزی و بسکێن وێ ب هێزارا بوویکینێن نەپۆشین
وەکی بوهارەکا گولیلکێن سۆر و زەر لێ نەبشکفتین
وەکی هاڤینەکا کولی دری و هەناڤێ رۆیێن وێ برین.
د ڤی زێماری دا، ئاوازێن هەبێن میناد سویکا کوردا، دەرگەهێ ژین و هیڤیێ، دلێبەر نەسافە، دلێبەر مر نەما ... هتد، وەک دیهی وێ پەرێن تە بێ سالا ژبیرکری، نەچرمسینە و نەدچرمسن.
خودانێ وێ ژی سەیدرخان سندی، هەر ژ ئوکە نێک ژ کلاسیکێن مەیە و هەر دەمەکی چیرۆک و بەسەرهاتیێ شعرا مەیا ڤی سەردەمی بێتە ڤەگێران، ئەو ئاڤی وێ و ئەو زێمارا وێ دەهێتە ژبیرکرن.

# د. بەدرخان سندی

# زێمارێن چیای

Spinoz Press & Publisher

**دەزگەها سپیرێز یا چاپ و وەشانێ**

**خودانێ ئمتیازێ:** حافظ قاضی

**سەرنڤیسەر:** مؤید طیب

* کتێبا هژمار ( ١ )
* کتێب: زێمارێن چیای
* هۆزانێن: د. بەدرخان سندی
* دەرهێنانا هونەری و کومپیوتەر: خەلاتی و گولی
* بەرگ: د. بەدرخان سندی
* چاپا ئێکێ
* ژمارا سپاردنێ: (٣٣) سالا ٢٠٠٢
* چاپخانە: وەزارەتا پەروەردێ ـ هەولێر
* تیراژ: (١٠٠٠) دانە

# پێش کێشه بو ..

روحا وی کەسی یێ کو من ل بچویکاتی یێ ب دزیکی ڤە بەرێ خو ددا وێنا وی یا ڤەشارتی ل بنێ جانتەیەکا بابێ من و دەمێ من گوتبایێ ئەڤە کی یە، دگوتە من .. نەکارێ تەیە.. دێ مەزن بی دێ زانی کی یە..

ئەرێ.. من زانی کی یە.. وەلێ من هێشتا نەزانی یە دێ کەنگی (هەمی) هیڤی یێن خودانێ وێنێ ب جه ئێن.. دێ کەنگی ئەو وێنە ل دیوارێن (هەمی) کوردستانێ ئێنە هلاویستن..

خودێ وۆ .. تو بێژی ئەز دێ بەری مرنا خو وێ مرادێ بینم..؟ بو تەیە خودانێ وێنا ڤەشارتی د دلێ مەدا.. هەر و هەر.. بارزانی یێ نەمر...

بەدرخان سندی

## پێش گۆتن

هوزان.. دەردە. ئێشە.. مروڤی دگرت وەلێ دەردەکێ خوشە.. ئێشەکا تام شرینە.

مروڤێ هوزانڤـان ژ ئەزل را ب مەیا کـوڤـانی یێ سەرخوشە و بەرەو ئەبەدیەتێ دچت و گورزێن پسیارا ددتە بەرسینگێ خو.. چەوا.. کەنگی.. بوچی..؟

جە ئەگەر گەهشتە بەرسڤێ یان نەگەهشت، نەخەمە وەلێ خەم د نهـویاتی یا ژیانا وی دایە.. د هەبینا وی دا یانهـویە.. ئەو خەم یان ئەو نەئێمناتی یا هەبینێ (القلق الوجودي) هێڤێنا ئەفراندن و داهێنانێ یە.

مروڤێ هوزانڤان دێ بازێرەکێ ژ پەیڤێن یاقیت و لەعل و زیڤ و زێرا ئاڤا کت لسەر لێڤا دەریایا ئەڤینی یە کا بێ سنویر وەلێ نزانت و نەڤێت بزانت وپێ تڤی نینە بزانت کو ئەو بازێرێ بدەستێ وی هاتی ئاڤاکرن هند پر بهایە و ئەو دەریایا لبەر وی بازێری چەند کویرە و چ ل رەخێ دی یێ

ئاڤێ هەیە.. ئەڤە نەکارێ هوزانڤانی یە دبت کارێ خویندەڤانێ هوزانا بت، نەمازە سەنگەڤانان..

هوزانڤانەتی عشقە.. ئەڤینی یە وەلێ (دلبەر) ب گەلەک شێوەیان و رەنگان تێتە هوش و نەهوشی یا هوزانڤانی.. دلبەر.. مروڤە یان وەلاتە یان ئومێدە یان مللەتە یان سروشتە یان شورشە یان بەرراوەستانە.. یان.. یان.. یان.

ئەڤ نەساخی یا مەژێ گوتی.. هوزان.. بەری چل سالا ئەزێ گرتیم.. و من نەڤێت چ جارا چارا ڤێ نەساخی یێ بکم.. هوزانێن من گەلەک جارا دهاتن ڤەشارتن.. کومەکا هوزانێن من جارەکێ ل بەغدا ب (إتلاڤ)ێ هاتن حوکم کرن ل چاپخانا (الحرية!!). گەلەک ژ بەرهەمێ من مخابن د ئاڤێ دا چون.. ئاڤا ژیانا ئالوز. دفتەرەکا هوزانێن من بەری هەژدە سالا بەرزەبی و ئەز چ جارا نەشێم وێ دەفتەرێ ژ بیر بکم لەوا هین دێ هندە هوزانا ل ڤێ دیوانێ بینن نەتمام کری نە چونکی هند ژوێ دەفتەرێ تێتە بیرا من و گەلەک هوزان ب ئێک جاری نائێنە بیرا من.

ژ دەست پێکێ من هوزانێن خو ل سەر ئاوایێ کلاسیکی ڤەهاندن و مەلایێ جزیری و ئەحمەدێ خانی کار ل من کرینە.

ئوشت و ئەگـەرێن سـەر بلندیا من ب مللەتێ کـورد گـەلەکن وەلێ ئێک ژ وان ئەگـەران ئەوە کـو ئەڤی مللەتی جزیری و خانی هەبی یە..

ل سالا ١٩٧٥ێ من دەست ب ڤەهاندنا هوزانێن سەر ئاوایێ نوی کـری یە و ئەز ب هەردو رەنگان هوزانا د ڤـەهینم و هەردو رەنگ ب من خـوشن و هەر رەنگەکێ (میزاجا) خو لنک من هەیە.

من دڤێت ئەز تێبینی یەکێ خویا بکم ئەوژی پێوەندی ب (املاء)ێ هەیە، هەتا نهـو مـە (املاء)ەک لێکدای و ئێک گرتی نینە، لەو من هوزانێن خو ل دیف لەفزا هوزانێ نڤێسی نە و هیـڤی دارم ژ خویندەڤانێن هێـژا لمن نەگرن ئەگەر دهندە پەیڤان دا نڤێسینا من وانا نە هەڤ رست بن، هیـڤی دارم دێ ئەو روژ ئێت ئەم هەمی کـورد ژ ئێسکەندەرونێ و هەتا کەلهورێ ب ئاوایەکێ ئێک گرتی باخڤین و بخوینین و بنڤێسین.

ئەز سوپاس کارێ دەست گەها سپیرێزێ مـە کـو ئەڤ دیوانە ل چاپێ دا و بەلاڤ کر. ئەز سوپاسی یا هوزانڤانێ کوردێ بەرکەتی و هەڤالێ خوشتڤی سەیدا مؤید طیب دکم سەرنڤیسەرێ ڤێ دەست گەهێ کو پێ خوش بی دیوانا من بکتـە نوبارا دەست گـەها خـو و ئەز پیـروزیێ ل هەمی

رەوشەن بیرێن کورد دکم بو پەیدا بونا دەست گەهەکا وەسا ل بادینا کــو دێ ب ئانەهی یا خــودێ بتــە چرایەک و دێ هەمی کوردستانێ ب بەرهەمێن بەرکەتی ب رەوش و روهن کت.

ل دویماهی یێ ئەز سوپاسی یا کورێ خو (هێژا) ی دکم یێ کو دەست خەتا ڤێ دیوانێ و هندە دەست خەتێن دی ژ مال ئینان دەرێ و ڤەشارتن بەری مالامە بێتە (تحري)کرن دەمێ ئەز ل بەغــدا هاتم گــرتنێ. ئەگــەر وە نەکــربا ئەڤ دیوانە و هندە کتێبێن دی چ جارا روناهی نەددیتن.

بەدرخان سندی

# بیرەوەریا بارزانی یێ نەمر...

خانێ خانان جانێ جانان(*) تو بکە لوتف و وەرە
دل لبەر دەستێ غوربەتێ بەندی یە و بێ مەفەرە

ئەم ل بەر شەوقا هیڤی یان چاڤ مەلێ یە بێ یە ڤە
تو بکە رەحمێ ژ مریدان کەنگی دێ تو هێ یە ڤە

بازێ بازان شاهێ کوردان روهنی یا چاڤێ مەیی
نێ مە نالینە ژ دیری مەی یا عشقامە مەیی

رازا عشقێ ژ قیدەم را دەردە یە و کوڤانە دل
کی دێ ساخ کت ژ ئەز ل را دل گەشە و پەروانە دل

ئایەتا کورسی ژ بەرکر مە جحێل و پیر و ژن
مە دوعا بو شەڤ و روژان ژ مەزار و ئینس و جن

شین ببن نێرگز ژ نوڤه بەر دەرێ تەکیا بەرێ
جاردن بخوینن عەندەلیب ئەو ژ عشقا دلبەرێ

لێ بەلێ دەستێ خودایی ئەوە نەقاشێ قەدەر
وی وەسا ئەمرەک وێ دایی سوتی یە ل مە جەگەر

شینیی و تازی ژ گەلی بون چەپ و راست و ژۆر و ژێر
شەڤ و رۆژ خەلکێ گری بون کال و گەنج و ژن مێر

مللەتێ کورد پر وەفایە صوفی ێن دەستێن تەنە
روح ژ ئێشان پر سەمایە عاشق و مەستێن تەنە

ئەرێ ئەی دل کانێ ئەو گول کا شەمالا گەش و هل
بوچی ئازار بویە ئازار بوچی باژار بو کاڤل

کا سیارێ هلما مرنێ کانێ میرێ ترس نەزان
کا عەگیدێ وان دلێران ئەڤرو مانە بێ خودان

ئاڤا ئاراسێ د پرست ئیرو کانێ گەمی ڤان
کانێ خورتێ خورتە مێران کا مێڤانێ نەخشی ڤان

لێ ب چونا ته هەر ئەمین سەر زەمانێ ته و بەرێ
چونکی تو هەی و هەر هەی ی روح و ویژدانی، ئەرێ

دلبەر و ئاشق هەر ئێکن لێ بەلێ رەنگێ مەجاز
جار ب جاران ب ئیجازەت هن ل هن دێ کت جیاز

پر ئەڤینا مللەتێ مە ئێکە گەل زاتێ مەلێ
ئەو ددل دا نیشتە چێ یە لێ بەلێ چاڤێ مە لێ

زاهر و باتن ئێک کەسە دشرعەتا عشقا زەلال
ئەو و کوردینی ئێک کەسن چ کەمال بن چ زەوال

گەر زەوالاتە هاتبت هەر دێ مینی تو و هەر
چونکی کوردینی نامرت چاڤ هەڤاله بو نەزەر

کو کەمالاتە گەهشتە گەش ستێرا موشتەری
تالعێ کوردان گەشایە مانێ تو ئەو پەروەری

وێنە یا سوز و دلێران خویایە سەر رویمەتێ
وەر بخوین ئەی هەڤالان ئایەتا خوش هیمەتێ

ئەو ژ زک مـاک دا پلنک بو شـاهدی حـەبسـا مـیـسل
هێـشـتـا زارو بو دەمێ کـو دیتی یە کـوڤـان و کـول

ئێش و دەردێن مللەتێ کـورد وی ژ هینگێ کـرنە دەرس
شـەهرەزایی و عـەقل و جـورئەت ئەو مـوکم لێ بونە دەرس

شـاهێ بازان مـیـرێ قـادان وی نەبادان هزر و بیـر
لەو ژ هینگێ ئەو ل سـینگێ جـانە بەخـشـێن گـەنج و پیـر

سـوز و پەیمان ئەم ددنـتـە گـەل تەدا و ئالا وەدا
ئەم بمینین بوتە سـەنگەر مـەشـخـەلێن رێکا وەدا

* جانێ جانان: روح الاروح

## بویکا کوردا

**پێشکێش بت بۆ بزاڤا شریف پاشای یێ کو خازناما مللەتێ کورد سالا ١٩١٩ێ پێشکێشی جڤاتا مللەتان کری پشتی بدوماهی هاتنا شەرێ جیهانی یێ ئێکێ.. ئەڤ هوزانە ل میهرەجانا ئێکێ یا هوزانێن کوردی سالا ١٩٧١ێ ل باژێرێ کەرکوکێ من خاند.**

ئەی فەلەک بو تە دنالم بۆچی نێرگز چرمسین
ئەو چما بەختێ مە هۆیە هەر بێ دۆست و بێ کەسین

قەت دێ هێت ئەو رۆژا مە دڤێت کەهنی یا واری بزێت
ژێ ڤەخوین دەستا ب هلەینین ژێ ڤەخوین چەند مە بڤێت

ئاگرێ سارو ڤەمری چاڤ مەلێ یە گەش ببت
ئەو بوهارا تێهنێ کوشتی هیڤی دارم خۆش ببت

کوردینۆ رابن ببینن بەرخەکێ ژار و زەعیف
دانە بەر پال و کێشانا خەنجەرەک دژوار ل دیف

ئەو وەریسێ تێ ئالاندی هەر ژ هریا بەرخی یە
پێ دکێشن سەربرینێ بوی وەریسی نوخی یە

مەزنا ژ مێژە گوتینە دوژمنێ سەرێ خۆ کەو
دار بداری تێت برینێ دەستکێ بڤری دارە لەو

نێ مە نالینە ژ بڤری سەد هزار جارا هەوار
ئەم ب وی بڤری کەتینە هند نەساخ و بریندار

نێ مە نالینە ژ مێژە بو حەتاڤەک روهن و گەش
داوەتی رابن سەمایێ پویچ بکن بەرپەرێن ڕەش

ئەڤرۆ کانی ل من وێ روژێ پر ژ خۆشی و رەنگە رەنگ
ڤەبگوهێزن بویکا کوردان ئەو تورینا شۆخ و شەنگ

کانێ کەو بۆچی ناخوینن کانێ وارێ گول گولی
لێ د چەرینن گورک و ریڤی بۆشە لێ مار و کولی

کـانێ مـزگـەفـتـا مـە تێـدا سـەد نڤـێـژ  رۆژێ کـرین
کـانێ دارگـیـزا تێـدا شین گـیـزە تەڕ مـە ژێ کـرین

کـانێ ریبـاریێ پر بزاڤ کـانێ پێلێن هیـڤی یێ
کـانێ بێـری کـاشـڤـان گـەش بکن کـوردینی یێ

کـا گـلاڤـێـژا مـە دیتی وەخـتـەکێ زێرین بژار
لەو مـە گـوتێ هندە ئێـدی هەر دێ مـینت ئەو بهـار

باخـچـەیێ ڤـینا نەمـایی کێ وەکـر کـاڤل ببت
تورینا بەخـتێ مـە ئەڤـرۆ کێ وەکـر زیز و سل ببت

ئەڤـرۆ کـانێ ل من وێ رۆژێ پر ژ خـۆشی و رەنگە رەنگ
ڤـەبگوهێـزن بویکا کـوردان ئەو تۆرینا شـۆخ و شـەنگ

دا ببـینم کچ و لاوان مل ب مـل بێنە شـاهی یێ
ببـژکـینم کـول و ئێـشـان بەر حـەتاڤـا سـاهی یێ

دا بهـەلینم ژ کـوردا ئالا سـەر چیـاێن پر ژ خـوین
دا هاوارکم ژ دلێ سـوتی هەر بژیت سـەربەست و ژین

نە گــونندەھ و نە شــەرمــە ژی گــەر مــەژی ئالا ھەبت
نە ئومــێــدەک کــوبر و دویرە باوەری ب ســالا ھەبت

دێ ژ کلوخــێن وان شــەھیــدان ســتــینەکێ درێژ ڤــەدم
پێ ڤــەکم ئالایێ کــوردان دا بگەھت طاڤــا گــەرم

بێــژمــە خــەلکێ ڤێ جــیــھــانێ ناڤێ کــوردا ژی ھەیە
کی دێ شــێت ناڤێ مــە تێک دت ھندی کــو رێبــەر ھەیە

ئەڤــرۆ کــانێ ل من وێ روژێ پر ژ خــوشی و رەنگە رەنگ
ڤــەبگوھێــزن بوبکا کــوردان ئەو تورینا شــۆخ و شــەنگ

بگرنژینم بەچکە شــــێــــران ئەو ھەلال و ئەو رحــــان
پزو زاروکـــێن شـــەھیـــدان ئەو کـــولیلکێن چ نەزان

بێنە ھێــزکێ ل ناڤ جناران خــەفک وداڤــێن خــۆ ڤــەدن
کــێل وڤــێــلان بچکلینن بێــژن ئێک دو خــو ڤــەدن

بێــژنە شــالیل و تڤــیــرکــان وەرنە ھێلینێن بەرێ
وەرنە ســەر گــولب و چەڤــێن خــۆ بخــوینن فێ بەرپەرێ

بەرپەرا ژینامە یا نوی ئەو ژیانا دیر ژ ژان
دیر ژ سالسکی و ریمەتی سەرفەرازی بو شیان

کوترینو دادن ژ دادێ بو خودێ دادێ نەکن
ئاهرەمەن ئەڤرۆکە پیچ بی سەد تلیلی بو ڤەدن

* هندە ستران بیژان ئەڤ هوزانە ستراندی نە وەک تەحسین طە و محمد شیخو و شڤان

# دستار

دەنگی دستاری گرینە
ئاخو فیغانو هەوارن
دەنگێ دستاری چیروکە
پر خەمن هەمی ژی ژانن
چیروکێن دەردێن ژیانێ
چیروکن هندەک پسیارن
قەسەنە بۆ مە دگێرینت
قەسەنە راستن نەنازن
بهێرە دستار بهێرە
خەمێن مە گەلەک گرانن
دستارو دێ تو بگێرینە
خەمو دەنگیتە هەڤالن

جـــارەكێ خـــەمـــا بهـــێله
مـــانـابت جـــارەک جـــودا بن
دســـتـــارو دانی تـو هیـــركـــه
پـێ بـێـــــــــــــژه بـلا بـزانـن
بهـــێـــره دســـتـــار بهـــێـــره
پێ خـــاســـو برسی و نەســـاخن
نه ئـێكه دســـــتـــــار نه ئێکه
هـەژدەجـــــــــــار هـزار هـزارن
بەلێ پـا دســـــتـــــارو چپكين
ل چار جـــهـــان ئەڤـــرۆ بەلاڤن

١٩٦٨

* تحسين طاهای گوتبی.

## شێخ عبدالسلام بارزانی

(هزر و ژیان)

ناڤێ شـێـخی شـێخ عـەبدول سـەلام بو
کـــورد ئەڤـــیندار و نازک کـــەلام بو

ناڤێ پیـــروز ناڤ کـــوردان بەلاڤ بو
هزرا شـێـــخی وەک بێـــهنا گـولاڤ بو

مللەت ب جـــارەک دیتن شـــێخ هەقـــە
بێ مـــەیل و مـــیـــزاج پر راست و دەقـــە

چاک و دروست بو شـێـــخێ شـــورش دار
خـــودان هزر بو، بۆ کـــورد ئەڤـــیندار

گـــەلەک ژ هزرێن عـــەبدول ســـەلامی
پر کـــومـــەلی بون بو خـــاس و عـــامی

دورر و گـــــــەوهەر و لـەعـل و زێـریـنـه
بیـــــرێـن رەســـەن و پاک و کـــوردی نه

وەلات ئـاڤ رویـێ ئـەنیـــــا زەلامـــــان
کـــورد نابت بژیـن وەکی خـــولامـــان

تو بێ ئیــمــانی گــەر نەراست بێــژ بی
گــــەر بۆ ملله‌تی تو نەخـــوین رێژ بی

فــەرق و جــوداهی ڤــێت قــەت نەمــینن
عــەدل و ئینســاف ڤـێت ســەری بهـەلینن

شـی کـــــرن ب زور قـــــەت چێ نابـتن
مــــــــەلایـێ دورسـت ئـەڤـێ نـاکـتن

گـوند ب مـەسـجـیـد و مـزگـەفـتـان بتن
جــــهێ کــــوم بین و جـــــڤـــاتان بتن

هەر گــوندەک دڤــێت کــومــەلە لێ بت
ئەو دێ حـوکـمی کت دەسـتــور دێ ڤێ بت

عــەشــیــرێن چەک دار ڤــێت دورست بن
دیف ســـەردارێن خـــو پر هەڤـــرست بن

هەر جـوتیـارەک ڤـێت عـەردێ خو هەبت
ب خـــــو بچـــینت ملکێ خـــو هەبت

شێخ عـەبدول سـەلام روژەک بی مـێـڤـان
مـێـڤـانێ عـــەزیزێ شـێـخێ بریفکان

خـــــودانێـن هەردو رێکێـن مـــــوبارەک
نەقـــشـــەبەندی و قـــادری ب جـــارەک

بریار دان خـــــانـدن ب کـــــوردی بتن
مللەتێ کـــورد پر هشـــیـــــاری بتن

کـــورمـــانجی ئەوە زمـــانێ رەســـمی
ئیـــســــلامی بتن ئاوایێ حـــوکـــمی

شـێخ و زەلامـان پێکڤـە سـیند خـارن
بو ڤـــان داخـــازان پر هێـــز و کـــارن

تەلگرامەک دان شارێ ستانبولێ
ئاگاه دارکرن سولتان بو شولێ

«سیبەرا خودێ» کو نامە وەرگرت
دەمارێ تورکان سەرێ وی پیس کرت

گوت ئەو چەوا کورد ئەڤروکە وێران
شەرتە وان بکم کاڤل و وێران

وی هێرش برە سەر کورد و کوردستان
مخابن هەڤال گەل شێخی نەمان

شێخ عبدول سەلامی گەل بارزانی یا
شەرێ خو کرن ل دەشت و چیا

شێخێ موبارەک دو هەیڤان خو گرت
عەسکەر گەلەک بون خوین کەلەک رشت

هندەک ژ ئاغان کەنکەنە و شێخان
گەلەک مخابن چون هاری تورکان

لەوا نەچار بو چو نک تیـــــاری یا
ب قەدر و قیـمەت هاتن پێشاهیا

ئەم ئەڤروکە کورد تەڤ ژ مار شەمعون
پر سوپاس کارین تاریخ ژێ مەمنون

شـێخ ب خـائینی هاتە گـرتنێ
سـوفی عـەبدولای دابو کوشـتنێ

دەستێ شێخی گرت گوت هەی شێخێ من
ڤـیت تو تەشـریف کی مال و ناڤێ من

شێخ ژی نەچار بو ئەو شەڤ بو مێڤان
ئەوی قـەت نەکر دل رەشی و گومان

وێ شەڤێ رابو مێڤانێ خو گرت
حوکمەت ئێنایێ خەلات ژی وەرگرت

مەلا مصطفی میرێ مە کوردان
ئەو سێ سـالی بو ئینانە زیندان

دەیکا پڕ حورمەت ئەو ژی گرتی بو
فەرمانا هاتی ژ پای تەختی بو

کو تەشریف کری شێخی سێدارە
ئەو ل زیندان بون ل رەخ قنارە

میسل دهەژا ژ بەر بێ بەختی
والی لەرزی سەر دەپێ تەختی

والی سولەیمان کورێ نەظیف بو
کورد بو بەلێ پا ئەو نەنظیف بو

شێخ عبدول سەلام دەرسەک مەزنە
چەندین نازک بو هند رەق ئاسنە

خودان ئیرادە و ب هزر و بیر بو
شەهیدێ کوردان سەردار و ژیر بو

١٩٩٥

# دەرگەهێ ژین و هیڤی یا

دەرگـەهێ ژیـن و هیـڤی یا گـرتی یە دیسـا چمـا[1]
مـا ژ ژینا کـورتە ژین بت مـا ژ عـەمـرێ مە چ مـا[2]

سـپـێـدەیا بێتن چ لێـبکەم گـەر دگـەنجی دا نـەهات
نێـرگـزا وارێ مـە وەریا و خـوناڤـەک پێـدا نـەهات

تـاقــەتا چەرخ و ســەمــا مــە نەمــا یارێ بزان
شینـی ی و گرین بو مـە مـان شـەربەتا ئاهـ و خـەمان

لەو دنـالـم لـەو دکـــالـم بـلبلـۆ .. هێـلین هـەرفت
ســەد هزار هێلین هەرفتن دژمنۆ تـەحــەق کــەرفت

بلبلێ بێ کـەس مـشـەخـتـە و کـاڤلە رەزێ گـولان
ئـاگـــرەک بەربی هناڤــا و تالانا جــەرگ و دلان

جانیکێن کومێدا رەڤین کەتنە ناڤ چول و چیان
لورینا گورگا ل نیڤ شەڤان بچاندن چەرگ و سی یان

ئاگرەک کەتە دلێ مە و چریسکەک ژێ ڤەبەیی
کەتە ئاسمانا و نڤێسی کوردو تو هەبی و هەیی

دەرگەهێ ژین و هیڤی یا گرتی یە دیسا چما ؟
ما ژ ژینا کورتە ژین بت ما ژ عەمرێ مە چ ما ؟

تە دڤێتن ئەز ببینم کەتییێ بارێ خوبم
ئەز مێڤانێ وارێ خوبم دەروزێ مالێ خوبم

بارەکێ ئێک جار گرانە و پەسارە رێکا مەژێ
شێخ عوبەید و شێخ سەعیدێ روهنە رێکاوا ل مەتێ

فەنەرێن تاریخێ د گەشن روهن یا چاڤ ودلان
دێ چ خوینم بەرپەران ئاڤ رویێ و ئێش و کولان

تازی یا قازی ژبیر نەکن بۆ بکن شینی هەر سال
کوزرین گولێن چیایان نێرگزێن شەنگ وشەپال

رستەکێن شەنقێ بو ڤەدان جان فیدائێن راستی یێ
چون سەر سێ دار و قناران هەوارە ل کوردینی یێ

عزەت و خەیری و قودسی مصطەفا ئەو چار برا
روهنی یا چاڤ و دلان هەر گەشن ئەو چارچرا

ئەو چرایێن مللەتینە شەوق ڤەدان بو مە لەوا
بلبلێن شەرمن دخوینن کوردو دێ رابە ژخەوا

دەرگەهێ ژین و هیڤی یا گرتی یە دیسا چما
ما ژ ژینا کورتە ژین بت ما ژ عەمرێ مە چ ما

زانا ونەزان هەر ئێکن کوردینو نابت ئەڤە
لەو ژ ئێشا ئەم دنالین هەر ل مە دونیا شەڤە

کاروانێن شەڤان دبورن لاوک و حەیران خوشن
رستەکێن ستێران دسوژن بو مەهارن لەو گەشن

گوهـ بدن دەنگێ بلیلان ئەو چەوا بو مە دبستړن
خوشە لێ دەنگێ نارینان دلێ مە تژی کولن

هەر ئەمین هەتا ئەڤ سـالە خـەونەکـە بشـێن بژین
وەک هەمی خەلکێن جیهـانێ وان سنویرا ژ خۆ ڤەدین

خـەونەکـە بشـێم ببـینم دەڤـرێ دلێ من خـاست
نابتن بو مـــە ببـــینین ژێرو ژوارن چەپ و راست

نابتن بو مـــە تەوافـــا ئەو جـــهێ لێ مـــەم و زین
نابتن ئەڤـــرو ببـــورین ژ توخـــیـــبێ خـــانقین

نابتن بچم نک خـــانی بو ڤـــەکم دلێ بخـــوین
نابتن بچم دێرســـیـــمێ بکەلێـــشم دلێ بئـــەڤین

دەرگـەهێ ژین و هیـڤی یا گـرتی یە دیسـا چمـا
مـا ژ ژینا کـورتە ژین بت مـا ژ عـەمـرێ مـە چ مـا

١٩٧٠

---

(١) چما: بۆچی

(٢) چ ما: چەند ما

## دلبەر... نەساخە!

ئەو شەپالا ئەز ژێ دیرم، ئەڤرۆ کوڤانە گەلو
روندکێن رێز رێز دبارن، ئەڤ چ فەرمانە گەلۆ

ئەز دزانم دلبەرا من، هەر یا پر ژانە گەلۆ
لێ چەوا ژ خەو نەرابی، ما نە دیلانە گەلۆ..؟

ما نە نەوروزە.. بوهارە، ما نەسەیرانە گەلۆ..؟
ئەو چەوا بلبل نەخاندن، بۆچی ڤەمانە گەلۆ..؟

بلبلەک هات چەنگ شکەستی، گوتی: تالآنە گەلۆ
شاعرو دلبەر نەساخە، یا بێ ئەزمانە گەلۆ

دەردەکێ گرتی گرانە، نە ژ نازانە گەلۆ
کانێ نوژدار.. کانێ زانا، لەرزە و تانە گەلۆ

دل ژ دل ئەڤرۆ پر کولە، دل بێ سەمیانە گەلۆ
هین دزانن کو ئەڤیندار، توخمێ لالانە گەلۆ

ئەو ژ بەژنێ را چ شوخە، بەژنا خانانە گەلۆ
یان ژ رویمەت قەت نە بێژن، ئەو پەری خانە گەلۆ

دلبەرا چاردە بوهاری*، ئەڤ چ فیغانە گەلۆ
قەت دبت دلبەر نەساخ بت، ئەڤ چ لەیلانە گەلۆ

ئەژدەهاک ئەڤرۆ د زۆرن، زۆری خاقانە گەلۆ
هەر ژ هینگی مللەتێ مە، دیل و قوربانە گەلۆ

زارویێن کوردان دکوشتن، مەژی دەرمانە گەلۆ
دا پێ ساخ بت شاهێ فارس، دەردێ مارانە گەلۆ

لێ نهو مار چارسەرینە، خوین لێ ئەرزانە گەلۆ
پێ و دەستێن مە دپیڤن، سەر بێ کێشانە گەلۆ

١٩٧٥/٣/٢١

* - ١٩٦١-١٩٧٥

# دلو من و ته مه دەرسوکا شرینێ ڕست

مه رست و مه رست و مه رست
ژ پرچا سەلوایێ
لبەر کەڤرێ «مەلێ»
پشتا خۆ دایێ
مه رست
ژ سەمایێ
لێ موخابن
سەد موخابن
گرگێن گر
کەتن ناڤ لبان
لبێن ژێک فرِ

لەو سەر و بن
تەڤنێ مە هات
خار و سست
موخابن سەد موخابن
تەڤنێ مە هات نەدورست
تەڤنێ مە هات نەدورست

* * *

مە رست و مە رست و مە رست
مە بۆ شرینێ
تەشیا خۆ رست
مە بادا و بادا وبادا
وەفائییێ دەروێش[1]
کەوێ شەمزینا
یێ سەودا و گێژ
لبەر تەشیا مە
سەما کر
لێ موخابن
سەد موخابن

دەروێش بەیی
تەشی شکەست
داڤ ڤەرست
و تەڤنێ مە هات نە دورست
تەڤنێ مە هات نەدورست

* * *

مە رست و مە رست و مە رست
ب شاخێن کویڤی یان
ژ هریا هیڤی یان
ژ کەربا سیابەندی
ژ هەوارێن خەجێ
خۆ لسەر کەلەخی
وەشاندی
ژ هەمی چیروکێن ئەڤینی یا
ئەڤینی یا ب ترس
مە رست
لێ کەسێ نەکر پرس
نە خودێ و نەکەس

موخابن
سەد موخابن
کەس نەبی هەڤرست
تەڤنێ مە هات نەدورست
تەڤنێ مە هات نەدورست

* * *

مە رست و مە رست و مە رست
ژ داڤێن برویسی یان
داڤێن زێرین
ل ئاسمانێن فرەه
ل نیڤێن شەڤان
د تەیسین
گلولا ئاڤرمیشی
مە هلکر
ل دور شیشا دلان
ژ ناڤ جەرگ و سی یان
لێ بەر بەرێ سحارێ
میرێ تەڤن رێسان

ژ بێ خەوی
ژ پیێڤە نڤست
تەڤنێ مە هات نە دورست
تەڤنێ مە هات نەدورست

١٩٧٥

---

(١) وەفائی: هوزانڤانەکێ صوفی یە گەلەک سالا ل شەمزینا ژیایە..

## سترانا مللەتی

شـێـست وئێکێ یازدە رۆژا ژ هەیڤـا نە
قـارەمـانان گـوتن ئەمین پێش مـەرگـە
لاوێ کوردا ب سەر چیایان ب سەر کەڤە
ڤـان چیـایان دەشت و زویران بەر نەدە

گـەلەک دیرە ئەم ببـینین رۆژ هەلات
ئەگـەر روینین خـودێ نادت چ خـەلات
ژین گـرانە یا نەخـوشـە بێ خـەبات
جـان فـیـدانە جـان فـیـدانە ئەی وەلات

پالـەوانان پێ خـەبـاتێ دانە سـەر
شـورش ژینە ژین وخـوینە و رێ لبـەر
ئەو ئاگـرە هەر دێ مـینت هەر و هەر
ژین درێژ بی ئەی مللـەتێ تێکوشـەر

گـەلەک خـوشـە مـروڤ بژیت سـەرفـەراز
واهە شـورش دەنگی ڤـەدت خـوش ئاواز
گـەلی کـوردا بێن رسـتـەک ئێک نیـاز
نەکـو بژین ناڤ نەیارێن خـوین خـواز

# هەسپێ منۆ.. دلبەر مر

هەسپێ منۆ لەزێ نەکە
ئەز نە بلەزم
ئەز نە بلەزم
نە ئەو کەسم
دیارە دلبەر نەما
تۆڕینا چاردە بهاری
خودانا لێڤێن شەما
چاڤ بەلەکا من
شۆخا من
دیارە نەما..

دیاره مر
چۆ و نەما

* * *

هەسپێ منۆ لەزێ نەکە
لغاڤێن خۆ نەجی
نەجی
هەسپێ منۆ
نە گری نە گری
بیرا خۆ بینە
هەوارێن مە
گرینا مە
بەختە بەختا مە
ژ دلبەرێ ڤەبن
دەقا ل رویمەتێ نەدن
خالێن درەو بۆ چێنەکن
کرێت نەکن
گول ئاڤا ئەرزان
لێ نەکن

خەلکینۆ
دێ نەساخ بت
دێ مرت
ژێ ڤەبن
چ لێ نەکن
چ لێ نەکن

* * *

هەسپێ منۆ لەزێ نەکە
لەزێ نەکە
بەختە بەختا مە
مەموی دوجارکی نەکوژن
سیابەندێ ڤەکوشتی
ل سێدارێ نەدن
ئاڤرویێ زینێ نەرێژن
بەکرۆکا نەیێن داوەتا
پەزێ حەسۆیێ شڤان
بلا بسەر پێسترکا شکەستی نەکەڤن
دێ ژوردا کەڤن

دارەک ژپێستركێ كێمە
لێ پەز ل دویف بلویلا خۆش
سەرخۆشە
ژارو پەزۆ
ژارو حەسۆ
ژارێ دلبەرا حەسۆی
خەجو
هەسپێ منۆ
لەزێ نەکە ئەز نە بلەزم
دلبەرا من
شوخ وشەنگا من
شەکراڤا ژەهردای
رۆژ ب رۆژ
ددانێ
هەسپێ منۆ
نە گری نە گری
بیرا خۆ بینە
هەوارێن مە
گرینا مە
بەختە بەختا مە

خەنجەرا دەیکا مەمۆی
نەئینن
سینگێ مەمۆی
دو جارکی
بەر بەرێ سپێدێ
پێ نەدرینن
دەیکا کۆرە نەنیاسی
گەلۆ بۆچی نەنیاسی
هەسپێ منۆ
نێ مە دنیاسی
نێ مە دنیاسی

هاڤینا ١٩٧٥

# گەرهانەک د کورستانێ دا

هاڤین بۆ چوم شنگارێ
هێژیرا ل دەم نوبارێ

من دیت ل وێرێ جوانەک
ئاور ددا ژ ئالەک

تیتی یا زێرا ل سەر ئەنی
دلێ من گرت و هنجنی

من گوتێ کچا کێ یی؟
تۆرینا کیش مالێ یی؟

تو گولا کیش باغچێ یی؟
نێرگزا سەرێ کێ یی؟

گوتی ئەز کوردستانم
خوشتڤی یا کوردانم

ئەڤیندارا شعرانم
کەتیمە دەست نەزانا

* * *

هاتیمە دیار بەکرێ
جهێ پیران و بەفرێ

نالینا کەوی تێتن
بریندارە وێ دکێتن

من گوتێ کەوێ کێ یی
چما ل ناڤ بەفرێ یی

چرا یێ بریندارى
خویندارێ دەستێ کێ یی

گوتی ئەز شێخ سەعیدم
بو کوردستان مریدم

شێخ سەعیدێ پیرانم
شورش ڤانێ کوردانم

بی کەس و بێ خودانم
کەتیمە دەست نەیارا

* * *

بو مەهابادێ گەڕیام
وەک دارا تووی ی وەریام

دارەک ددەست بچیکا
پێ دکرن یاری یا بیکا

من گوتێ ئەڤ چ داری
وەک رەبەنا لڤی واری

ل کولانا د خشاندن
ژ نیڤێ را شکاندن

گـــــــــوتـی ئـەز دار ئـالا بـیـم
نــاڤ بـــەیــنــا چـــار چـــرا بـــیـــم

ســـویند و قـــەســـا مـــەردابیم
ئەز قـــــیــــبلەیا کـــوردا بیم

ســــهـــا ســــەرێ خــــۆرتا بیم
کــــەتیـــمــــە دەست بچـــیـکا
* * *
ســــەر ئەڤـــراز چۆم شکاکـــا
ناڤ مــێــرخــاز و مــێــر جــاکــا

شــــەرکـــــەرووێ خـــــورت و زورن
تـورک و عــــــــەجـــــــەم ل دورن

خــــــورپـینا شـــــێــــــری تیێتن
شــــــەوقـــــا ژ چاڤـــــان پیێتن

مــن گــــــــــوتــێ لاوێ کــێ یــی
تـو شـــــێـــــرێ کـــــیش وارێ یی

ئاشق و مەستێ کێ یی
خوین دارێ دەستێ کێ یی

گوت سمکویێ شکاکم
سەرێ خو ئەز شور ناکم

کوردینی یێ ژ بیرناکم
کەتیمە دەستێ هارا

* * *

هاتیمە ڤە شنگارێ
دەف وێ شەرمن و ژارێ

کاکلا ناڤ کاکلی
توی شیشا ڤی دلی

چما تو یا پر ژانی
پوسیدە و کۆڤانی

تو بوچی زیز و سلی
بەرێ خو دی وی ملی

گـــــــوتـی مـــــــا تـۆ نـزانـی
دێ مـن دنـــه بـيـــــــــانـی

لـێ مـن ســــــیـنـده بخــــودانـی
دێ گـــــوریـکـم ڤـی جـــــانـی

نـــەمــــــــان و یـان بـارزانـی
ئـەز نـاچـم گـــــەل خـــــویـنـدارا

١٩٧٠

* ل سالا ١٩٧٢ ل هولا زانکوا (مستنصریه) هاته خاندن.

# تو ژ مێژه سەرفەرازی*

**ژ سەروکێ مەزن مصطفى بارزانى پێش کێشە ١٩٧٢**

تو ژ مـــێـــژه ســـەرفـــەرازی
تو ژ مـــێـــژه مـــافـــه خـــازی

کێ بڤـــێت تە بچـــەمـــینت
دێ مـــرنا خـــۆ بچـــاڤـــا بینت

گـــەلی کـــوردا ببن رســـتـــەک
ببن ئێک دل ببن دەســـتـــەک
دا بمـــینـــین دا بمـــینـــین

تو ژ مێژه بو ڤی واری
پر بزاف و پر هەڤکاری

کێ بڤێت تە ژ مە بچنت
دێ ژینا خۆ ژ خۆ ڤەرەنت

لەو کوردینو خودێ لگەلە
چونکی بۆ مە یێ دل کەلە
دا بمینین دا بمینین

تو چرا یێ مە کوردانی
روهنی یا رێکا خورتانی

لەو خودێ تە رادگرت
دوژمن بگوریا خۆ دمرت

گەلی کوردا بۆ نە دفێرین
دوژمنا ژ دۆستا بژێرین
دا بمینین دا بمینین

تو ژ مێژه ڕاست پەرستی
تو ژ مێژه مافە دۆستی

لەو مللەت هەمی ژ وی یە
بژین بمرین بو وی یە

گەلی کوردا هەر بژیتن
ئەو کەسێ بۆ مە بژیتن
دا بمینین دا بمینین

* ئەڤ هوزانە ب هەلکەفتنا بزاڤا کوشتنا بارزانی یێ نەمر موخابن ژ هندە مەلاێین مێڤان یێن ژ بەغدایێ هاتبون، من ڤەهاند. تەحسین طەهای کرە سرود.

# چ بکم ئەز

گـەر نێـچـیـرڤـان ژ نێـچـیـرێ برەڤت ..چ بکم ئەز
زارو ل بەر ســـــینگێ دایێ نەنڤت ..چ بـکم ئەز
گــەر پەر ل بەر بابەلیـــسکێ نەلڤت..چ بکم ئەز
ئو کــەس ب دەردێ ڤی دلی نەکــەڤت..چ بکم ئەز

* * *

باخــچـەڤــان ژ باخێ گـولان سل ببت..چ بکم ئەز
دەســـتێ نوژداری پر زوخ و کـــول ببت..چ بکم ئەز
کـەڤـیـا بەفـرێ وەک ئاگـری هل ببت ..چ بکم ئەز
ئو کــەس ب دەردێ ڤی دلی نەکــەڤت..چ بکم ئەز

* * *

گــەر شــوره عــەورێن شــوباتێ نەبارن ..چ بکم ئەز
گــەمـیــڤـانێن دەریا نە مــەلەڤــان بن ..چ بکم ئەز
پەل د پـەلەدانـا ئـاگـــــری نـەگـــــرن..چ بـکـم ئەز
ئو کــەس ب دەردێ ڤی دلی نەکـەڤت ..چ بکم ئەز

* * *

کـــوتر دوست کـــوترا چارچرا بکوژن..چ بکم ئەز
کـــەوێ شـــەمـــزینا یاریا پێ بکن..چ بکم ئەز
شـــێـــرێ پیـــران ب پیـــری هلاویسن..چ بکم ئەز
ئو کـــەس ب دەردێ ڤی دلی نەکـــەڤت..چ بکم ئەز

* * *

خەج خۆ ل دیف سیابەندی نەهاڤێژت..چ بکم ئەز
مـــەم ژ زینێ را چ پەیڤـــان نە بێـــژت..چ بکم ئەز
خـــابیـــر ژ تێـــهنا ئاڤـــا خـــۆ بمێـــژت..چ بکم ئەز
ئو کـــەس ب دەردێ ڤی دلی نەکـــەڤت..چ بکم ئەز

* * *

گـــەر زورنا بێـــژ نەڤـــێن بێنە داوەتێ..چ بکم ئەز
گـــەر دارێ داهولامـــە تیکەک کـــەتێ..چ بکم ئەز
گـــەر دنیـــڤـــا شـــاهی یا گـــریا مـــەتێ..چ بکم ئەز
ئو کـــەس ب دەردێ ڤی دلی نەکـــەڤت..چ بکم ئەز

* * *

* ل ســالێن حـەفـتێ یان سێ ئەندامـێن پارتی ێن مـەزن هاتن بەغـدا و دژ شورەشێ راوەستـان پشتی هاتنا وان ب هەیڤەکێ. ل ئاهەنگەک هوزانا ل بەغـدا ئەڤ هوزانە من لپـێش مـەزنێ وانا خـاند ل هولا (حـصـری) و تێگەهشت من چ گوتێ..

# کوردستان رۆژناما ماک

**پێش کێشە بو ئێکەم رۆژناما کوردی، رۆژناما کوردستان کو ل سالا ١٨٩٨ێ ل قاهیرێ دەرکەتبی.**

کوردستان
رۆژناما ماک
دەیکا رەبەن
بەرپەرێن تە هێشتا دمشەختن
پەیڤێن تە هێشتا دخەونا خۆدا
مەستن
هژمارێن تە
کت کت پەریشانن
پر ژانن

هژمارێن ته
رێڤێنکێن پایتەختا بین
مێهڤان بین
و هێشتا مێهڤانن
کۆچەرن
بێ کەسن
کەتی ێن بەختانن
هێشتا لقوناغەکا هێمن
لوارەکێ بێ ترس
ب ترس
دگەرهن
لێ
موخابن
چەند نێزیک دبن
قۆناغ و ێڤە دڕەڤن
وار دویر دکەڤن.. وار دویر دکەڤن
* * *
کوردستان
رۆژناما ماک
دەیکا رەبەن

رێزێن بەرپەرێن تە
ئێک ئێک
ددلێ کەوەکێ کویڤی دا
ڤەشارتینە
کەو تێتە کەهی کرن
خودان کرن
سەرژێ کرن
تێنە کڕین
تێنە فروتن
کەو تێنە گرتن
لێ دەلالا من
دلێن کەوا
کەهی نابن
کەهی نابن
چەند کەوگرێن
ڤێ دنێ
بێنێ
رۆژەکێ بشێنێ
دلێ کەوێ کەهی بکرن
شرینا من نەشێنێ

لەوا دی یێ
کوردستان
رۆژناما ماک
کەو بدلەکێ سۆتی
پەیڤ پەیڤ
هەر سحار
هەمی رێزێن تە
هەمی پەیڤێن تە
پێکڤە دخوینن
پێکڤە دخوینن
* * *
کوردستان
رۆژناما ماک
دەیکا رەبەن
تەمبیرڤانێ تە
تل پێڤە نەمان
شەڤ و رۆژان
وی داڤێن تە دژەنی
ل هیڤییێ بۆ
سترانا نەگوتی

تو ژێرا ب ژەنی
لێ شرینا من
میقداد چۆ[1]
لاوێ بەدرخان
تل پێڤە نەمان
ژگەڕهانا
پێ پێڤە نەمان
هەمی حوبرێ ڤێ دونیایێ ڤەخار
وەلێ سترانا هیڤی یان هەر نەهات
پەیڤێن وێ سترانێ
هێشتا دسینگێ زەمانی دا
ئاسێ نە
ئێنس پێغەمبەر
ژ بنێ حەفت بەحران
هاتە دەر
حوبتی بەردا
ژ زیندانا خۆ دەرکەت
وەلێ سترانا لاوێ بەدرخان
هێشتا
ل چ عەردا دیار نینە

خورتۆ
میقدادو
ئاشقێ تەمبیرڤان
براۆ.. سەیدایێ نڤێسڤان
چما..؟
چما ئاڤا خۆرتان
سەر ئەڤراز نەکەت؟

١٩٧٩

(١) میقداد مدحت بەدرخان سەرنڤێسڤانێ رۆژنامێ بی.

# سروودا مللەتێ مە نەمرە

مـلـلـەتـێ نـە مــــــــرە
ئـەو ژ مــرنـێ مــەســتــرە

پـر بـاوەرو خـــــۆ گـــــرە
ئـەو بـۆ ژیـنـێ هـۆگـــــــرە

ئـەی دلـێـــــرێـن وەلاتـی هـاش خـــــۆ هـەبـن
هـیــڤـی دارم هـیــڤـی دار هـێن بـســـەرکــەڤـن

مللەتێ مـــە پر ئـومــــێــــد و ئـەیـڤـــەزە
بـۆ خــــەبـاتـێ تـێــــهـنـی یـە لـەو یـێ بـلـەزە

لاوێ کـــــوردا چەپەرێ خــــــۆ بەرنەدە
مـــســـتـــەکـــا ئاخێ نەدە چ جـــار نەدە

گـــەلی کـــوردا باپیـــرێ وە کـــاوەیە
خـورتە مـێـر بی ئەو پلنگ شـێـرێ مـەیە

سـوورە خـوینێ گـەل ڤێ بەفـرێ تێکەلە
سـورو سـپی بی جـه وەلات لەو دل کـەلە

کـوردینی یا مـە ئاگـرەکـە هەر هەلە
ئـاگـــــردانـە دلـێ مـــــە تـژی پەلـە

مـلـلـەتـێ نـە مــــــرە
ئەو ژ مـرنێ مـەسـتـرە

پر بـاوەرو خــــۆ گـــــرە
ئـەو بـۆ ژینـێ هـۆگـــــرە

* ئەڤ سرودە تەحسین طەهای ل سالا ١٩٦٧ێ ستراند.

## دەنگ ڤەدانا خانی

ئەز نەمـــام د حـــیکمـــەتا خـــودێ دا
کـــــورمـــــانج ژ بەر چی مـــــانە درێدا

مـــاکـــا ژانیێن مـــە ســـەیدایێ خـــانی
دەلیـــــڤـــــە هات بەلێ مــــە نەزانی

چەند جـــار ددیروکـــان دەلیـــڤـــەتێن؟
کـــێم جـــارا کـــانی ێن بەخـــتـــان دزێن

لێ دەمێ کـــانی یا بەخـــتـــێ مـــە زای
ئەم خــــۆش کــــەتین یاریا چەق وطای

هندەک بۆن ژ چەپ هندەک بۆن ژ راست
هندەکـــاژی ســـەرێ هندەکـــا خـــاست

ئاگر کەتە بن پێمە کوردان
نزانین بلەیزین وەک مەردان

دەستێ بن بەری بۆ مللەتێ ژار
وان گەلەک ژان دیت ژ بەختێ خوار

پسیار ل هزرێن مە خۆش بارینە
بۆ جەژنێن مە هەمی قوربانی نە

ملەت د جەژنادا جانەگا بو
ئەو ب چ حەق گوری یێ جەژنا بو

راستە ئەم د دەولەتا دنێ دا
هولێنە ژ ئادم دا و پێدا

ژێ هەل ببیران دچین ئومێدا
ژوردا ب ژانان تێن سێ دارێ دا

باوەر نەکە ژ توخمێ حیکمەت بت
بەلکو ئەو ژ رەنگێ مەشیئەت بت

خـانی چێـتـر دزانی مـەشـیـئـەت
تێـتـە گـوهارتن وەلێ نە حـیکمـەت

حـیکمـەت درەگـەز دا بێ لڤـینە
مـەشـیـئـەت چێـبین وگـوهورینە[1]

لەو مـە ئومـێـدە ژ خـودانێ مـەزن
بگوهۆرت مـەشـیـئـەتا کـەڤن

هەتا نهـو پەیامـەک مـە نینە
کـوردینی ل بامـە کـەرب و خـوینە

گـەر مـە هەبا ژ مـێـژە کـتـێـبـەک
دا خـویابت بێ گـومـان مـە رێکەک

پەیرەو رێک و ئارمـانج خـویابا
نوژدارێ مـەزن جـەم مـە پەیابا

چارەیەک بۆ مـەژی نڤـێـسی با
ملەت ب خـودان با نەسـێـوی با

بەختێ مە دا ل بوراقێ[٢] سیاربت
هینگێ دا حیکمەتا وی دیار بت

سێ صەد صالان پشتی تە فەرموتی
چرایێ هونەران ما نیڤ سوتی

ژ مێژە ئەم خودان کێماسی نە
بێ دەریاین، ئەم شۆک و ماسی نە

نێچیرڤان ناچنە خۆ نێچیرێ
ئەو نابت بێ ئارمانجێ تیرێ

لێ موخابن ئەم ئارمانج و تیرین
ئەم مار و دارین ئەم ژەهرو شیرین

ب ئێک دو ڤەدین گەلەک دژوارین
ئەم دناڤ خۆدا کێر و قەنارین

بو بیانی ئەم دەشت و زەڤینە
بو خویانی، دل، پر زوخ و خوینە

بۆ، بو بیـــــانی ئەم خـــــۆش بەنینە؟
بۆ، بو خـــــویانی مــــارێ گـــــەزینە؟

گــەر ب خـەنجــەر نەچین خــۆ ب زمــان
کـــــرێت دکین ئێک و دو بێ یەمــــان

گــەر جــامــێـــرەک ژ ناڤ مـــەدا رابو
ل هەســـپێ خــوش رەوران ســـیـــار بو

بێ پارە هندەک دێ ئێنە کـــــاری
ئـــالـــوزە بـــکـــن رێـــکـــاوی تـــاری

ئالوزە دەردێ کـــــوردان ئەی خــــودان
نـــە زوری چـــارە دکـــت نـــە ویـــژدان

(تەعــیین) ببــو ژ بۆ مــەرا تەخــتــەک
لێ نەهات دگــەل دا بۆ مـــە بەخـــتــەک

بەخـــــتێ مــــە ژ مـــــەرا نابتـــــە یار
گـــەر بۆ هەڤ نەبین ئێک دل و ئێک زار

قـــابـيـل و هابـيـل ســـەر ژ نـوى رابۆن
خـــويـندار و دوژمـن ديـســـا پەيـدابۆن

پێـــشــــينـان ب ڤـى دەردى گـــوتـينـە
قــەســێـن مــەزنا نـەخــشــێـن بەرينە

ئەز ئاغــا و تو ئاغــا خـــر ئاغـــا
گــول دێ چـن گـيــفـک دێ کــەڤنە باغـا

ئەز مــا مــە د حــيـكمــەتا خـــودێ دا
زانـينـێ شـــيـــتـكا مـــە نـەگـــرێدا

هـەتـکـا مـــــە پـيس چۆ ل ناڤ وەلاتـان
ناڤێ مـــە رەش بو ل ناڤ جـــڤــاتان

مــــەتـوەرا ديـت ســــيـــبــــەر و پەناهى
خـــــۆشى وئـەڤــــينى ژينـا تـەناهى

وە نـەهـێـــــلات ئەو خــــۆشى شين ببت
کــــەڤنە ديرۆکـــا مــــە ڤــــەژين ببت

فارابی ئاڤاکر ب خەیالێ
بازێرێ هێژا[٣] ئینا کەمالێ

کۆمارەک[٤] دورست کر ئیفلاتونی
ئیناتە هەبونێ ژ نەبونێ

سوقراتی خۆشی ڤیا بۆ دنێ
ژ بۆ (ئەثینا) خۆ دا کوشتنێ

وان ئیسبات کر کو دونیا ب چاکی
خۆش ئاڤا دبت ب ئاڤا پاکی

ئاڤا پاکیێ ل جەمە کێمە
خوین دگەل دا تێن عەداب وکێمە

ئەم براستی هەنە نە خەیالین
کەڤنارین، کاف و رێنە ئەم دالین

بەختێ مە ژمێژ هاتبا دانان
کەتبا دەستێ داناو زانان

شیشتبا مە ژەنگێ دلا ب پەشک
گەلەک لێ کربا طاڤی و تەرک

دا نەمابا رەشاتی یا جەرگان
تاری نەببان چاڤێن مە کوردان

بەخت دهزرا مەدا نە قومارە
بەلکو بناس و گەرو دورکارە[٥]

بناس[٦] گەلەکن لێ گەر پترن
دەور و پشتێن مە دزو رێ گرن

خانی سێ صەد صال سەرمەدار بۆرین
سەر نوبارا پیروزا مەم و زین

لێ هێشتا بەکروک ساخ و بهێزن
بەکرۆک ئێک بۆ لێ ئەڤرۆ رێز رێزن

گرتینە ب فەندا دەستێن مەمی
چاڤ بەستی ئاڤێتن بنێ گەمی

دیر کرن وانا ژ زینا دلبەر
برن دەریایێن بێ بن و بێ سەر

هاڤێتن زەریاییێن بێ ئومێدی
یا ژوانا زین بێ هیڤی بو ئێدی

لێ زین شەمالا ناڤ دلا هلە
دجەرگێ کیڤی یان ژان و کولە

زین ل بەر ئاڤا ئەڤینێ روینشت
کۆترا هیڤی یان وێ نەڤەکوشت

گوت مەم هەر هاتی یە ونابت نەئێت
ب عشقا من گولاڤ دێ ژ بەری زێت.

---

١- الصيروره والتغير
٢- بوراق: هەسپێ پیروزێ میعراجێ یە
٣- المدينه الفاضله
٤- جمهوريه افلاطون
٥- دورکا: ظرف
٦- بناس: سبب. گەر: (العله) ژبناسێ کەڤنترو ودویرترە

# هەرا شینی

تو ددلدا هەرا شینی
تو د جەرگی دا دمینی
تو روندکا دبارینی
ل نیڤ شەڤان دنالینی
دنالم بو هزر و بیرا
دەلالا ژ توخمێ میرا
سلاڤ بو نێرگزێن دیرا
تو لێ بکی گەر ببینی
دزانم دل بریندار ی
گەلەک دیرن رهێن داری
دەلال هویە ئەڤینداری
لەوا دارێ هەرا شینی

* سەیدایێ دلشاد ساز دابو و هونەر مەند سیتا هوگوبیانێ ستراند ل سالا ١٩٨٢.

# میرێ چیایان بارکر

کو میرێ چیایان بارکر
رەڤدەیا کەوان وی ژار کر
تالانا دلێ مە راکر
ئادارە بەلێ ب شینە

بنڤە میرم ب دل تەنایی
پەزێ زۆزانا وێ زایی
نێرگزێ دیسا گول دایی
لەوما دیسا مە نارینە

شڤانێن واری گەلەکن
خورت و زۆر و چاڤ بەلەکن
بنڤە ئەی میر ئەو زیرەکن
وەک بەرێ بێری خاتینە

سلاڤ بو میرێ شڤانان
ژ مەرگێن نێرە بەرانان
رێڤێنکێن رێکێن زناران
ئەلند نێزیک و زێرینە

١٩٨٥

## نەهات

دیل و ئێخسیری ژ گەلی بون سەر فەرازا من نەهات
مـام دعـیـشـقـا وێ شـەپالێ سل و زیزا من نـەهات
چاڤ دنێـرم ئەز ببـینم خـوش عـەزیزا من نـەهات
گوهـ من دا ئاواز و لاڤچان دەنگێ سازا من نەهات
ئەز ژ کـەعـبێ را مـریدم حـەج و فـەرزا من نـەهات
جـەژنە و سـونەتە ئاشـتی پر عـاجـزا من نەهات
شـڤـانێ دەشت و زوزانم بەرخـانەزا من نەهات
داوەت و شاهیـان ڤـەقـەتیـان جـان وتازا مـن نەهات
تێـهـنی وتاڤ و تەحـرەیە سـهـا گـیـزا من نەهات
چەند مەکر هاوار و یەمان کەس بو دوزا من نەهات
کێ وەکی مـە مـوبتـلایە کـەس ل رێزا من نـەهات
مـام ل نێـچـیـرێ ژ مـێـژە شـاهو بازا من نـەهات

عـود و سـەنتـور بسـتـرینە خـوش ئاوازا من نـەهات
مـن ب ژحـراوێ قـەبیلە مـار وگـازا مـن نەهات
ئەز ب حوکمێ مرنێ دایە (نەقزا)[1] قەزا من نەهات
دەرفـەتە حـاکم ببـینم رۆژا حـەزا من نـەهات

(١) نەقزا قەزا: نقض القضاء

## بالاڤی یێ

هو شـــــرینێ بالاڤی یێ
هو تورینێ خـــۆشـــتـــڤی یێ
ریـبــــــــاره پـیـێل پـیـێل دبـۆرن
نـابـورت پـیـێــــلا هیــــڤی یێ

قەت دێ هێت ئەو پێلا ژمێژ
ئەم ژ بەر وێ سەودا و گێژ
دا پێ بشوین جلک و سەرا
دا نەمـــــینن دوژن و قـــــرێژ

شـــرینێ خـــۆشکە ئاگـــری
گـەشکە وەک باباگـورگـری
بالاڤ ب گـەرماڤان خـۆشە
دا ژ خــــۆش یا بکم گـــری

دا بشـــــوين ژارێ بو ژارا
كـوشــتى ێن ديتنا بهــارا
بۆ دلێـــرا بۆ وان مـــێـــرا
بۆ شـــەهيـــد و وبريندارا

پەلاتينكێن رۆناهى يێ
تێهنێ ێن ئاڤا كەهنى يێ
دا پێ بشوين بۆ وان كەسان
خـودانێن رێكا راســتى يێ

* تە حسين طەهاى ل سالا ١٩٦٨ێ ستراند.

# نەوروزا ١٩٩٠ێ

نەوروزا من چل و شەش سال بورین
هەر ب زێمـــارم ئەز هەر ب لۆرین

پار ڤی دەمی تە ژیڤـــانەک دابی
وەلێ برین مـــا وئێش نە تەنابی

چ بـوتـە هـلـکـم نـێ چاڤ چـرانـە
ئەز چ بســــوژم دل ئـاگــــر دانە

روحـەک مـەیێ مـای گـەر تە بڤـێتن
گــــــوری تـە بـکـم دا دەلال بـێـتن

نیٚ کــوره بیم نەوروز ژ هیــڤی یا
چیـــروکــێن بزدیای ژ نیــڤی یا

هەر ســال رەز دخــەملن ب گــولان
عــاشق تێن دسـوژن جـەرگ ود لان

ژ خـــودانیٚ مـــەزن ئەو دخـــازن
تشـــتـــەکیٚ ژ کـــاروانی بزانن

بەلکو کــاروان ئیـــســڤی بینن
ســاخ ببت ئاقــیب خـوٚش ببـینن

رابن ژەنگ ژ دلیٚ بیٚ کـــەســـان
خـــالی ببت دنیـــا ژ تەرەســـان

خــوناڤــەک ب نێــرگــزیٚ دا بێتن
ئەو نێـــرگـــزا ژ تێـــهنا دکـــێتن

نەوروز تیٚ نە گـەهە من تو نەڤیٚ ی
تو کـــەهنیی ددلیٚ من دا دزیٚ ی

گـــەر دالاهی یان ئەز ل تە نەکم
کی دێ گول من بت کوڤانم و کەتم

رویبـــارێن دنێ نەوروز پر خـــەمن
کـەلەکـێن خـەمـان رێز وگـەلەکن

کـەلەکـێن ب ئومـێـدان بارکـری
ب پرچا بچـویکان کـەزی ێن بری

ب گوهارکـان کولاڤـان گول ئاڤـان
کلدانان دەرسـوکـان ب سـلاڤـان

ب سـتـێـرا رژیای لێ نەڤـەمـری
ب هەیڤـەکـا زەر نیف سـەرژێکری

کـەلەکـێن مـە گـەلو بارکـرینە
ب سـەڤـیـان هەتا لێـڤـا گـرینە

ئەو ل هیـڤی یا کـەلەک ڤـانی نە
ریبـــارێن دەردان ژێ هەل رابینە

ئاڤا خورتان سەر ئەڤراز چویی نە
نەوروزا من مزگینی یان بینە

نەوروزا من چل و شەش سال بۆرین
هەر ب زێمارم ئەز هەر ب لۆرین

هۆزانا من ڤیای تو نائینی
پەیڤێن چاڤ مەلێنە ناوەشینی

## دو کەوێن سیپانێ خەلاتێ

دبێژن دبێژن
ئاسمانێن کوردان
تژی مژن
عەورێن رەش
خو لێک ددن
ستێرێن مە
دێ دیسا
رژن
دێ مە گرن
دێ مە گورین

دێ مه كوژن
كەنی یا مه كری
خۆشی یا مه بری
دێ بنه برین
كۆڤان و خۆین
دێ لمه ژەنن
دبێژن.. دبێژن

١٩٧٤

# تویی دلبەر

تویی دلبەر
دلبەرا من
دلبەرا هەر و هەر
شرینا بەرێ
دلبەرێ
خودانا زێرین کەمەر
دل رەق نەبە
تویی شرین
تویی ئەڤین
لێ دلبەرا من چ بکم
نێ چبکم
ژ دەریایا ئەڤیناتە
چبکم!!

تورینێ نێ مەرگم
د دارا هەبینا تە
بەلگم!!
بەلێ موخابن
سەد موخابن
دلبەرا دلێ من
خەلک لڤێ دنێ
بمن و بتە
ژ دل.. ژ مێژ دکەنن
شرینا من خەلک دزانن
وەکتە و وەک من
هەمی دزانن
هەمی دبێژن
ژ هزارێن سالان
دوژمنێن شەلو شەپکان
تە ل باژێرێن غەریبی یا
تینن و دبن
تە دگێرینن
تە دکرن
تە دفروشن

تە بکرێ دن
دلبەرا من
سیانهی یا هەردو چاڤێن من
ئەز دزانم
دەنگێتە ل نیڤێن شەڤان
زێمارێن تە
دکەڤنە بەر گوهێن من
ئەز دزانم
هندەک تە ژ دەستێ راستێ
دکێشن
هندەک تە ژ دەستێ چەپێ
دبن
و هندەک پێش چاڤێن برایێن تە
هەمی برایێن تە
بەژنا تە دپیڤن
و هندەک ژبنێ پیا
کازی دکن
مەزادە..
مەزادە..
مەزادە..

کاجا دەلالا دلا
شرینا مەلایێ جزیری
بزڤره
خو بادە.. خوبادە.. خوبادە

* * *

تویی دلبەر
دلبەرا هەر و هەر
دلبەرا نهو و بەرێ
زەری یێ
پەری یێ
ئەسمەرێ
دلبەرا من
دل بەر نە بە
شرینا من
دەرسوکا مە رستی
ژ داڤێن زێرین
ژ پەیڤێن سەر خۆش
ژ کێلی ێن مەست و تەر

ژ هوزانان

دلبەرێ

دلبەرا هەر و هەر

دوێ دەرسوکێ دا

ئەز داڤم

دەلالا من

دناڤ کێلی ێن وێ دا

بەلاڤم

لێ چ بکم؟

دیسا کەتی غەریبی یان

دەست گرێدای

سەر پشتێ کێشایی

کراس هەلدایی

لنیڤا چار چرا

خودێوۆ چرا..؟

بوچی گەلی برا؟

بەر چیروکا قازی

بهشیاری دنڤن؟

بەر چیروکا سمکۆی

ژ پێڤە دمرن؟

بەر چیروکا سەلوایێ
هێلین ژ سەر داران
ژوردا دکەڤن؟
تا تێنە مری یان!؟
د قەبرێن خودا دهەژن!
خودێوێ چرا..؟
لێ خودێ هێشتا بێ دەنگە
لەوا برا
شاعر هەڤن
بنالن
دل بریندارن
پر کەلەمن
پر چەڤن
هەڤن
نەکو کراسێ دلبەرێ دیسا
پیس ببت
دەهمەنێن وێ
دیسا ببن تەڤن
نەکو دیسا
دەنگێ دەللالا  بێتە ڤە

دەمێ دەللال
گازی دكن
مەزادە..
مەزادە..
مەزادە..
كاجا جانا دلا
شرینا مەلایێ جزیری
بزڤرە
خوبادە.. خوبادە.. خوبادە

* * *

تویی دلبەر
دلبەرێ
دلبەرا هەر و هەر
نەخشا ددلێ خانی دا مای
خەونێ
هیڤی یێ
كویڤی یێ
دەلالا من

شەنکە بی یێ
هندەک ژ لاوێن تە
هەر حەفتی
حەفتی بو حەفتی یێ
قیژەکێ بەرددن
ب زمانەکێ بیانی!!
پاشی داوەتەکێ دکن!!
رۆژا پاشتر
ژ شەرمێن خۆدا
تێن هەردوو چاڤێن من
تینن دەرێ
د پەقینن
شەرما خو بهندێ دبن
دلەکێ شاعر
دێ دنە بەرپی یان
دێ تەپکانی پێ کن
سەرێ حەلاجێ ژار
دێ دیسا لکولانان
راکێشن
لبن رەپ رەپا پێن وانا

دەنگەک تێتە گوهێ حەلاجێ کوشتی
ژ دویرڤە دبێ
هلو خودانا دەرسوکێ
خودانا شعر پێ گوتی
بەرێ خۆ بدێ
توخمەکێ نوی ژ مرۆڤان
پەیدابی یە
د چونادا نالڤن
ب هشیاری تێر دنڤن
ژ موختاری موختارترن
ژ پەز کویڤی یان پەز کویڤی ترن
لەوا گەلو شاعر هەڤن
گەر بسۆژن
گەر بپەڤن
دلبەرا ڤی دلی
ئەز دزانم
ژ بادانێ گێژی
ئەز دزانم تو دیسا
برینێن خو
برینێن بەرێ

لبن کەپرا شاعرەکێ
ب هەردو لێڤێن خۆ
دمێژی
لێ شرینامن چ بکم
دەنگەک وێ تێ
دیسا دبێ
مەزادە..
مەزادە..
مەزادە..
کاجا خانما مەلایێ جزیری
بزڤرە
خوبادە.. خوبادە.. خوبادە

* * *

تویی دلبەر
دلبەرا هەر و هەر
تویی ئەڤین
تویی بزاڤ
تویی لڤین

جەرگ و هناڤ
توبی شەڤ
توبی هەیڤ
توبی رۆژ
توبی تاڤ
توبی ئەز
توبی ئەم
توبی هێن
دلبەرێ
دلبەرا هەر و هەر
توبی هەمی
دلبەرێ
دلبەرا هەر و هەر
توبی گەمی
توبی مزگێن
توبی هیڤی
بۆ کولیلکا زویرهای
ژمێژە
نەگرتی خوناڤ
توبی هیڤی

بۆ ستێرەکا ئێخسیر
بۆ ستێرا رژیای
شەڤا سەفەر کری
دئاسمانێن ئەڤینی یا
شەڤا سەفر کری
ژ وەلاتێ جەرگی
بۆ وەلاتێ دلی
لێ ناڤ بەینا هەردو وەلاتان
سەر توخیبێ
ناڤ بەینا جەرگ و دلی
دەریایە..!
لوێرێ ستێرامە
رژیایە
گەلۆ دەریایە
روندکەکا کالەکێ پیرە
وەریایە
کانێ گەمی ڤان؟
کانێ مەلەڤان
ستێرا گەشا گوندێ مە
ژ بنێ دەریایا روندکان

دەرینن
ل ئاسمانێن ئەڤینی یان
سەر ژ نوبی
بلند.. بلند
بفرینن
چیروکەکێ ژێرا بێژن
بخوینن
چەوا ستێر سەفەرا دکن
ل وەلاتێن ڤێ دنێ
و نارژن..؟
دلبەرێ..
وەرە دەرێ
داوەتا کولیلکا زویرهای
هەر سحار
تێتە کرن
بەر قەب قەبا کەوان
پێش بەری
دەللال رابن ژخەوان
دیسا دەنگێ وان وێ بێ
گازی بکن

مەزادە...
مەزادە...
مەزادە...
کاجا تۆرینێ
شرینا مەلایێ جزیری
بزڤرە
خوبادە.. خوبادە.. خوبادە

* * *

تویی دلبەر
دلبەرا هەر و هەر
دلبەرێ
خوش ئەسمەرێ
دەنگێ تە سترانا مانا منە
ئاورێن تە
دەرمانێ ژانا منە
جا دێ چەوا ژ تە دویر کەڤم
گەر دویر کەتم
هینگێ دارەکا خرشم

بێ رهـ و بێ بەرم
ڤێت بکەڤم
لێ شرینا من
عشق پرسه
ئەڤینی نڤێژەکا بترسه
نەکو دلبەرێ نەمینی
نەکو میرێن دزا
نیڤێن شەڤا
دلبەرێ تە بڕەڤینن
لەوا گەلۆ
دلێ شاعران هەردەم بترسه
چاڤێ شاعران تژی پرسه
شاعر نه گونەهـ کارن
شاعر سەر خۆشن
بەلێ هشیارن
لەو...
لەو...
لەو...
گەر گونەهـ کاری یا شاعران
پرسەک بت

دەلالا دلی نەکو دیسا بێتە فروتن
جارەکا دی پێش چاڤێن باب و برا
بێتە دۆتن
گەلۆ گەر ئەڤەبت
گونەه کاری یا شاعران
هزار جارا گونەه کارم
هزار جارا گونەه کارم
گەر کرێت یا شاعران
لێدانەکا دلی بت
گەر کرێت یا شاعران
روندکەکا کەلی بت
نەکو سەلوا دەلالا مەلای
شوخ و شەنگا مەلایێ جزیری
خودانا بەژن و بالایێ
دیسا
ل شەڤەکا بێ شەرەف
ب سەرکۆلی
ڤەچرت سینگ و ڕویان
ل کۆلانێن غەریبی یان
گەر ئەڤەبت پرس

گەر ئەڤەبت ترس
گەر ئەڤەبن گونەهکاری
گەر ئەڤەبن کرێت یێن شاعری
هزار جارا گونەه کارم
هزار جارا گونەه کارم.

* ئەڤ هۆزانە ل سالا ١٩٨٥یێ من ڤەهاندبی ل ١٩٨٧/٣/١٩ یێ ل هولا بزاڤا خویندن گەهی یێ (النشاط المدرسي) ل دهۆکی من خاند.

## شورشا ئەیلولێ

ئەی شـــورشـــا ئەیلولا مـــوبارەک
گـــریامـــە تێتن ئەڤـــرۆ ب جـــارک

گـــرین دو ئەگـــەرێن خـــۆ هەنە
ئێک ژ خـــۆشـــیـــان یادی ژی ژەنە

دل ژەن وخـــۆشی ئەڤـــرۆ تێکەلن
ســـیـــسنین شـــەنگەدار پێت وپەلن

ئەی کـــاژا ب دەســـتێ بازێ بارزان
هاتە چاندن و دهاتە ئاڤـــــدان

بەر سیبەرا تە کاژێ ئەم رازاین
باژێری و عەشیر ژێرا ژیاین

سال دبورن و هەر تویا گەشی
بلند و بەرین وسیبەر خۆشی

ل چەرخێ بیستێ سالا شێست وئێک
ل هەیڤا نەهێ یازدە رۆژان رێک

تورینا ئەیلولێ خودێ دابو
دەمێ ژێهەل ژ ژوردا جودا بو

چەندین خانم و دلبەر پەیدابون
چەندین ئاشق ژ وان را شەیدابون

لێ چیروکا ئەیلولێ جودایە
پەریزادە یە و ئاشق مەلایە

دلبەرا ئەیلولێ باش دزانی
سەمیانا میرێ میران بارزانی

عـشـقـا چيـايان عـشـقـەكـا كـويرە
چەندين پێ بێـژن هێـشـتـا يا دويرە

د دلـێ لـنـاڤ دلـێ كـــــوردا بـو
ئەو و چيـــايان پەيمان گـــرێدا بو

پەيڤا پێـشـمـەرگـە هاتە ڤـەژاندن
سـەر ژ نوى ناڤێ مـە هاتە شـاندن

د دنيـــايـێ دا كـــورد هاتە نـاسين
مـللەتـين ئەم پـر زاخ و پركـــەسين

ناڤێ كـــوردان هاتبـــو ژبيـــر كـــرن
هويە بـێ خــــەبـاتى و بـێ كـــــرن

لـێ دەمـێ داوەتـا خـــــورتـيـنـى يـێ
ســەرهەلدا ب زاخـــا كـــوردينى يێ

عـەگـيـد ومـێـرخـاس هـاتن شـاهى يێ
كـــال و پيـــرێن مـــە پێش بـەراهى يێ

ب برنو و چفــتــه و خــەنجــەر و گــوپال
دەيــک وباب وبـرا ومــــــام وخــــــال

پێکڤــه بســتــرين ئەی ملکێ کــوردا
چ بخــێــر و بێــره عــەردێ مــه تەڤــدا

پێنج ســـالا ســـەر دلبـــەرێ ڕا بورين
نەساخی يەک گرت دەست و پێ لەرزين

پەژی يەک بەلاڤ بو دگــوتنێ دو بەش
عەورەک سەر مەدا گرت طاری و رەش

دو پشكی چەكـــەكێ گـــەلەک هاره
ژ هەمی چەكــــان پتــــر ب كــــاره

خــۆشی نەهێــلان بو وێ گــوڤــەندێ
بو وێ ســـتـــرانێ مـــەقـــام و بەندێ

دوژمن پێ خـــۆش بو دەمێ كـــو زانی
هنـدەک ژ پـالان دژێـن رەزڤـــــــانـی

رەز وەســـــــا تـێـن تـالان و دزینـا
ئاگـــــر وەســـا گـــرت دار و هێلینا

خانی ئەو رەسمێ تە ژ مەراکـێـشـای
پاشـــە رۆژا مــە تە ل قـــەلەمی دای

ئەو پاشــە رۆژ هات لێ نە بتــمــامی
هێــژ ئەم خـولامـێـن بو شـیـر حـەرامی

شــیــر حـەرام هارە مــارێ سێ سـەرە
نـاڤـی نـابـێــــــژم هـویـە قــــــەدەرە

سێ ســەر خـــویانە ئەو لدور مـــەنە
حـەفت سـەر ژی زورن ئەو لناڤ مـەنە

سـەرکـێـشێ کـەوان بەخـتێ خـودێ دە
دەرفـــــەتێ نـەدە بێـن دمـــــالـێ دە

ئێک ئێک ژێ بگرە ئەڤـان سـویخـرا
بـۆچـی د بـلاڤـن ل دور بـێـــــــــدەرا

ئەڤـــە هێـــرشـــە وەلێ بێ دەنگە
گـــەلەكێ پیـــســـــە دوژن و ژەنگە

ژەنگ بێ قـــیـــمـــەتە وەلێ دشـــێتن
رۆژ لـدیـڤ رۆژێ ئـاسـن بـشـكـێـتن

خـــــــانـی دزانم قـــــــەلـەم درێـژم
وەلـێ نـەگــــــرە ئـەز دل ڤـــــــەرێـژم

من رەخنە نەگـــرت بو كـــرێت كـــرن
بەلكو پتـــر مـــاتی بێـــتـــە كـــرن

دەلالا رحـــان شـــەنگ و جـــان تر بت
دلبـــەرا بازان شـــوخ و خـــان تر بت

گـەر كـێـمـاسی هاتن خـوبا كـرن
قـــەنجی و خـــراب هاتن جـــودا كـــرن

دێ روهن بت رێكا دلبـــــەرا مــــە
دێ خـــۆش خـــەملت ســـهـــا دارا مـــە

ناکم گـــــــازنـده ژ تـه پـەری یـێ
دەهـمــەن پاکی تـو شــەنگێ حــوریێ

ناکم گــــازنده ژ وە ئاشـــــقـــــان
مللەت دورســـتـــە بێ ســیچ و تاوان

وەلێ هشـــیـــاری ئەڤــرۆ داخـــازە
دوژمنێ کـــوردان تبـــعـــەت بەرزاە

## سلاڤەک بو زانکوا دهوکێ

ئەی گومبەدا سەر بلندا　　چێکەرا رەوشا ئەلندا
نوشدارا برینێن بەرێ　　بینەرا دیروکا هندا

بو چاخێ ئەسمان ولیزەر　　بو دەمێ تەناو بێ شەر
گەشدار بکین کوردینی یێ　　ب مەرگ و هوش و پر باوەر

زانا و خورت و زیرەکین　　حەتا وەلاتی خوش نەکین
سویندە ب خودان و ئاڤ رویێ　　بێهنا خو ئەم قەت ناڤەکین

زانکوڤانین ئەم ناچەمین　　لاوێن کوردستانێ ئەمین
چرایێن رێکا خزمەتێ　　پەیرەوێن پەیڤ و قەلەمین

دلبەرا عشقا مریدان　　روهنی یا مەرگێ شەهیدان
زانکوا بیرو باوەرێ　　هیڤی یێن خانی گولی دان

کەنینا پشتی گرینان  بەفراڤا کەتی ئوێتینان
گومبەدا کێلیا شەدایێ  شاهدا دەرد و برینان

سەنگەر و بیشا زانەیان  هێلینا بەرزا دانەیان
خانمێ شوخێ دلبەرێ  روهنی یا چاڤێن کورەیان

بورجا مە کەتە خوشی یێ  پشتی پەسارا هیڤی یێ
سەلوا یا عشقا جزیری  دەرکەت ژ پەردا تاری یێ

موژدە و کەیف و مزگینی  خوشی ی وکەنیا مەتینی
دورشم و رەمزا هەیبەتێ  هوگرا دونیا و دینی

زانکوا مێران و خورتان  زانکوا خانم و دوتان
قیبلەیا خانی ی و گوران  ژ بانە و هەتا بوتان

١٩٩٨

## تۆلا شەهیدان

گــــەر رهێن دارا هلکێـــــشن
هەســتی ێن ســاخــا بکەلێــشن

ئــاڤ رویــێ کـــــــــــەوا بـرێـژن
خـــــوینا نێــــرگـــزا بمێـــژن

دێ ڤـــەکین تـۆلا شــــەهیـــدان
دێ ڤـــەکین تـۆلا شــــەهیـــدان

* * *

ئەی وەلات ئاهان نەکـــێـــشـــە
پاشـە رۆژ  هێـشـتـا ل پێـشـە

ســـویند بچـــاڤێ چەند پلنکان
دێ کـــەڤت تەخـــتێ نەهنگان

دێ ڤـــەکین تۆلا شـــەهیـــدان
دێ ڤـــەکین تۆلا شـــەهیـــدان

* * *

مللەتێ ل هیـڤی یا ئومـێـدان
شەڤ دێ تیک بن بەرسـپـێدان

دێ بلـنـدبت تـاڤـــــــا ژینێ
شـەوق دێ دت دەریایێ خـوینێ

دێ ڤـــەکین تۆلا شـــەهیـــدان
دێ ڤـــەکین تۆلا شـــەهیـــدان

* * *

بــــۆ هــــەواراتـــە ئـــەی وەلات
مـەرگ و جانێ مه خۆش خەلات

دا بـكـن نـەڤـێ ین مــــە گـــازی
هەر بژی تـو ب ســـەرفـــەرازی

دێ ڤــــەكين تۆلا شـــەهيـــدان
دێ ڤــــەكين تۆلا شـــەهيـــدان

* * *

* ئەڤ سروده سەیدایێ دلشاد ل ۱۹۸۳ێ ساز دا و ل دهوكێ هاته گوتن.

# وەریــس

**(ژبۆ وەریسێ سێدارا قازی محەمەدی پێشکێش بت)**

ئەی وەریسێ هشک و زڤر و لویل وشور و داکەتی
قەت تە زانی ئەڤرۆ کەو بو نێر و مێ سەودا کەتی؟

یان تەزانی هو وەریسو بگەردەنا کێڤە نیسیای؟
مارەکێ دژوارو رەش بۆی تە ڤەگەست و پێڤەمای

تە شڤان گرت و پێڤەدا و بۆرەبۆرا پەزی یە
کەهرکا ئێک سالی کوشتن خودێ وۆ هێشتا زوی یە

هۆ بلند و سـەر سـێـدارێ تو دمـرنێ  چەند بلندی
هۆیە تـوخمێ سەرفـەرازان زوی دبیـن خوش ئەلندێ

چەنـگ ببـالـندان نەمـان سـوسنا رەنگێ خـۆ بەردان
دل گـەمی بو شـەڤ رباتێ خـوینە دەریایە ژ دەردان

تە چ هاش عـشـقـا کـەوانە چ دخـوینن شـەڤ و رۆژ
چ دنالن چ دکـالـن خـەم گـرو کـوڤـان و سـۆژ

خـەم ژ تـەمـبـیـرێ دبارن ئاخ و ئوخ زورنا دبێ
دل ژ زێمـارێن بلیـلان شـرکـە خـوین و زوخ ژێ تێ

خۆ تەباش دیت ئەی وەریسۆ کا چەوا وی سەر هەلاند
هینگێ هاتی بو سـەمایێ دار سـەما خـۆ لبن هەژاند

هوبە گـەر عـاشق سەمـاکر دین و دونیـا دێ بن ئێک
کـەو ژبو عـشـقـا نێـرگزێ خـوشـە لێ ئامـانج و رێک

لەو مە نارینە وسەر خۆشین شـاهدی تو ئەی وەریس
لەو مـە دیلانە ژ مـێـژە بو هەتاڤـا گـەش نە سـیس

لێ وەریس قـەت تێ ناگـەهی ئاهـ وفـیـغـانا خـەجـۆ
کـــو خـــەجێ هاتە مـــرادێ خـــۆش مـــراد رابی و چو

ئەی وەریســـــۆ پێ تڤی بۆ تـو بزانـی چەند ژمـــێـــژ
کـــەو ب نـکلان ڤـــەدزەلـینن طا ب طا بەنکێن درێژ

١٩٧٩

# بپێژە

بپــــێـــژە یـاریٚ بپـــێـــژە
بپـــێـــژە و بـەرا پیٚ بێـــژە

بـرسـی یٚـن واری گـــــەلـەکـن
رێڤـــێـنکێن رێـکێـن خـــەلەکن

خـــورت و زۆرن دەست بچـــەکن
پێش مـــەرگـــێن چاڤ بەلەکن

هەڤـیـرکـە ب رونـدکـا بشـێلە
دلیٚ مـــە بۆتە خـــوش ســێلە

هەڤیرکە ل سەر خانکێ جەرگا
ب تیـــرۆکـا ب لیلێن تفـەنگا

هەڤـیــرکـە ژ ئاخـێن و هلمـا
ئاگـــرێ دلێ مـــە هل مـــا

بپــــێــــژە یارێ بپــــێــــژە
بپــــێــــژە و بەرا پێ بێـــژە

ئاگـرێ بن سـێـلا سـسـتـە
داری یێ دارا بێ پشـــــتـــە

زینا بۆ مـــــەمی نەمـــــایی
درەوە و ســـەد جـــارا مـــایی

زین ســــاخـــــە و پر ب ژینە
لێ فـــێلێن دورێن مـــیـــرینە

بپـــێـــژە و گـــەر دار نەمـــینن
دەست و پێن بەکــــرۆکی بینن

بێــخنه بەر کــوچک و ئاگــرا
دەردێ مــــه بەکــــرۆکــــه برا

بپــــێــــژە یارێ بپــــێــــژە
بپــــێــــژە و بەرا پێ بێــــژە

بپــــێــــژە ژ هەڤــــرانێ دلا
ژ ئاهێــن و ئاخ و کــــــــولا

ئاخــینکێن ناڤ دلی دشــینن
گــــــــورێـخن هارن و دینن

دلێ مــــه رەزێ هیــــڤی یا
باخـچەیێ میرێ کیـڤی یا

کــیــڤی ێن وارێ مــه زۆرن
لێ هندەک شاخێن وان شۆرن

بپــــێــــژە یارێ بپــــێــــژە
بپــــێــــژە و بەرا پێ بێــــژە

بپـــێـــژە ئەڤێ پســـیـــارێ
ســەر ســێــلا ســۆرا زێمــارێ

خـانکێ مـە بۆچی خـەت خـەتە
نانێ مـــە بۆچی قـــەت قـــەتە

گـەنمێ مـە فـیـرکـە و ناگـەهت
ئاڤـا مـــە ســارە و ناکــەلت

بپـــێـــژە یـارێ بپـــێـــژە
بپـــێـــژە و بـەرا پێ بێـــژە

١٩٧٢

* ئەردەوانێ جانە مەرگ ئەڤ هوزانە ب سترانکی گوتی یە.

# سترانەکا بریندار

**پێش کێشە بو محەمەد عارفێ جزیری**

خـــانمێن عـــشـــقێ دادان ئەو ژ ئەســـمـــانێن شین و دیر
فێ ســحــارێ پێکڤــە هاتن بســتــرین دل کــانێ مــیــر؟
مــیــرێ تەمــبــیــرا چ لێ هات کــانێ قــەوال کــانێ پیــر؟
کانێ مسحەف کانێ جەلوا کانێ حەرفێن گەش و ژیبر؟

کــا خــودانێ دەنگێ زێرین خــوش بەرێ هەر خــێــڤــەیە
لاڤــــچـــەیا کـــوردا چ خـــوشـــە پر پەیام و نامـــەیە
تو دجـــــەرگـــــادا ژی یایی ملـلـەتی هاش تە هەیە
ئەز ژ تەمـــبـــیـــرێ چ بێـــژم، دەرگـــەهێ بێ مـــفـــتـــەیە

گـــورزەکی ســـالا تە گـــوتن ئێش و نالینێن بخـــوین
گـولا مـــەحـــروم و گـــدیانو، جـاســـمـــو گـــەل مـــە دژین

صـــــالحـــــو لاو، سلىَ ژى، خـــــرابـوو هزار بـريـن
ســـەيدايێ دەنگێ كـــوردانی هوســـتـــايێ دەردێ شـــريـن

هەڤكـيـــڤێ دەنگێ تە نينە كـــەس وەكی تە نەشی يا
باو بـاروڤـــــێن زيـپـــــەيا دەنكـێ زێمـــــارێـن دی يا
تاڤی يـو تـەرزێن بـهــــارا رۆ و ســـيـــــلاڤـــێن چيــــا
هاوارێن بێ كـــەس و ژاران رێڤـــێنكێن چەپ و ری يا

لاڤـــجـــەيا تاڤـــا هيـــڤی يا ئەز دزانم تە نە گـــۆت
ئـەو دســـــــيـنـگـادا وەرارە ئـاگـــــــــر و پـەل و بزۆت
شـــەرمنە تەمـــبـيــــر ژ رۆژا هندەكـــا ســـەمـــا فـــرۆت
عــــارفـــو ســـــەيدا دزانم دەنگ و رۆندک بونە جـــۆت

وی ژ بـەژنا دار ئـومـــێـــدێ تەمـــبـيـــرەک بۆ مـــە رەنی
شــــەڤ و روژان وی هەوار بـو تـا و داڤـــــێـن دل ژەنی
پەردەێن تەمـــبـيـــرێ نازبـۆن جـار گـــرى بۆن جـار كـــەنی
ئاغـــايێ عـــشـــقێ تو بوجـوی ئاگـــرەک كـەت چيـمـــەنی

تـە دخـــازت شـــەڤ و روژان تەمـــبـيـــرا پر خـــەم و ژان
بێ كـەســـە خـــانما عـــشـــقێ ئەو غـــەريبـا بێ خـــودان

ئەز دزانم وێ چ دەردە ئاشــــقـــــە و شــــەڤ زێرەڤـــــان
دەردێ لەیلایێ گــــرتی یە ئاخ یەمـــــان و صـــەد یەمـــــان

کی دێ ســـاخ کت وێ برینێ نوش و چارا وێ وێ نەهات
ســـپـــێـــدەیا خـــوینا خـــۆ رشـــتی بۆ هەتاڤـــەک نەهەلات
خـــرێنا تەڤـــر و مـــەربێـــلا ژ شـــاخکێ تێ ئەی کـــەلات
تـو کــــــەلاتـا هـونەرا بـوی ژ دهـوک را بـوی خــــــەلات

نێـــــرگـــــزێن زاخــــو و جـــــزیرێ ڤێ بهـــــارێ رانەبین
شـــــــــینی یا ســـــــــالاتە رادکن دێ هلو رابە ببین
هوســـتـــایێ ئاهێن و دەردان خـــەلک بو چونا تە گـــرین
خـــــودانێ دەنگێ چیـــــــایی بلبلو دێ ســــــەر هەلین

ئەی مشەختێ ناڤ مشەختان تو ژ بچویکاتی مشەختی
تە ژ جـــزیرێ دابو رێکێ، بەر بالیـــفک و کـــەڤـــر تەخـــتی
زناکـــاران دەرێخـــســـتی تو عـــیـــســـایێ ئەوی وەخـــتی
رەڤـــاتە ژی هەر ئاگـــربو ژ بێ بەخـــتی بۆ بێ بەخـــتی

ب هەلکەفتنا سالەکێ ل سەر کوچ کرنا محەمەد عارفێ جزیری.

# سندی و رەشوانی*

ئـــەی بـــراوو ژ چـــرایـــە
خـــوینا مـــە یێ بێ بهـــایە؟
ئـێــش و ئـازارت لـە بـەرچـی
ئـەم ژیـانـەت کـــــەی رەوایـە؟
پـســیـــار نەکـە بۆچی هوومـە
واهە (راســـتی) یا خـــویایە
کــــە دەزانی راســــتی وایە
مـەعلوومـە (راسـتی) هیـوایە
واهە راســـتی بێ مـــاتی یە
کـــــەسێ باوەر پێ نـەینـایـە
بـاوەر بینـین بـا بە راســـــتی
راســـــتی رزگــــاری لەیلایە
ئـەگــــەر ببین دەست و دلـەک
دەست ئـاسـنە دل پـیــــــلایـە

راستە یەکیەتی من و توو

لە ئاسۆی گەل دا نووسرایە

کەسەک نینە مە بشکینیت

دەستێ ئاسن کێ بادایە؟

دار پتەوبێ زۆرئەمینێ

داری کرمۆل دارزایە

راستە برا چو ژمە ناهێت

نەیارێ مە ژڤان جهایە

دومەل هەرچەند کۆن ببیتێ

چارە نەکرێ، بنی مایە

چارە نینە ئەگەر روینین

هلۆ برا قەسە بایە

ئەمروو رۆژی تێکوشینە

قسە باوی هیچ نەمایە

قسە تیرن دا بهێلن

کەس بگوتنا نەژیایە

رەگی ناکۆکی هەل کەندن

چاکترین چارەی ئێستایە

ئەگەر هاتوو مە راکێشان

هینگی وەلات یائاڤایە

کـــونه بریان با ســـاریژ کـــەین
نەلێین برینمـــان هەلوەشـــایە
کـــانـێ ئەو رۆژ من دڤـــێتن
خـــۆزی ســـالان ئەو رۆژ زایە
دەســـــتت بێنـە تا مـن و تـوو
بنیـــاتی نێین ئـەم قـــەلایە
تو نـەبێـــژە (ئـەم قـــەلایە)
بەلـی بێـــژە ئەڤ چیـــایە
گـەل ئەمـێنێ، ئێـمـە ئەمـرین
نــابــێ بمــری ئــەم بــروایــە
ئەو باوەری هەریێ گـــەشـــە
هەر دێ مـــینت بۆ مـــە ســایە
هەر کـەسێ بۆ گـەل دلســوز بێ
بۆ ئەم رایە جـــان فـــیـــدایە

---

* ئەڤ هوزانە من و رەحمەتی احمد رەشوانی پێکڤە ڤەهاند، من بەیتەک دگوت وی بەیتەک دگوت هینگێ ئەز ل ئوتێلەکێ ل باژێرێ هەڤلێرێ بیم و سەیدایێ رەحمەتی ب مێهڤانی هاتە نک من .. سالا ۱۹٦۷ێ بی، ئەڤ هوزانە ل رۆژناما دەنگوباس هاتە بەلاڤ کرن (دو بەرەکی یێ) هەڤالینی یا مە تێک نەدا.

# سەیرانا هزران

مە سەیرانەک برە هزرا و بهارا مە کەتە ویرێ
ل ناڤ بەینا دو شیلانان ل ناڤ لێڤێن کەنی زێرێ

ل سەر کێلیا ئەنی بەفرێ دبارت بەفرا زۆزانێ
وەلێ سوتن هناڤ و جەرگ ژ رەوشا ریمەتێن جانێ

بهارا مە دو نێرگز دان دو چەهڤێن خۆ یارێ هلدان
ل گەل کەنیا شەپالا من بنێن دارا چ جان گول دان

ژ بەژنێ را خودێ چێکر چ پەیکەر نائێنە قامێ
سها بەژنا ئەڤێ شوخێ ببوو نەخشا ب خوش خامێ

ب هەیبەت بو چنارا من کو وێ پرچا دەلال بادا
غەما عشقێ وەکی بازەک ل سەر بانێ دلی دادا

کەتم هزران و تەخمینان کی دێ چێکت وەسا تازە
بەشەر نینە وەکی وێ بت چ سحر و طلسەم و رازە

کەتم بەندا دو چاڤێن وێ حساب بوم ئەز ژ صور دینا
وەلێ ناکت ژ مە پسیار نزانت ئیمان و دینا

* موخابن ئەڤ هوزانە نە هندەیە بەلێ بەرزە بی یە و من نەشیا سەر و ژنوی ڤەهینم ڤە، د دەفتەرا من دا بی ئەوا بەرزە بی.

# هندەک ژ چاخێ ئەڤینێ

دەمێ ئێکەم چپک ژ بارانێ
ددیروکا جیهانێ دا باری
ئەرد پسیارا چپکێ کر
تە چ دڤێت؟
گوتی ئەز هاتم تە هوی بکم
ئەڤینی یێ .. بەرگرتنێ
دلێ ئەردی لەرزی
هەژا..
پاشی مروڤ .. بی
* * *
دەمێ دبتە شەڤ من رۆژ دڤێت

دمێ دبته رۆژ من شەڤ دڤێت
شەڤ و رۆژ پێک هاتن
من بگرن باڤێژن نیڤا دەریای
وەلێ دەریا جهدا هشک بی
چونکی گونەها من ئەڤینی بی
ئەڤینی دویژدانا دەریای دا
زمانێ خودێ یە
* * *

دەمێ بو ئێکەم جار
چیروکەکا ئەڤینێ
سەر ڤی ئەردی
پەیدابی
ئو چاڤێن دو عاشقا ڤێک کەتن
هینگێ ئەرد نەدزانی باران چنە
ل وێ رۆژێ
برویسی کەتن عەسمانان
ئەرد هاتە شوشتنێ
چیا پیربین ژ چیروکا ئەڤینی یێ
کەلێن چیایا کراسێن سپی

یێن بەفرین کرن بەرخو..
هەتا نهو ژی بەفرینن .. سپینە
* * *

دەمێ رویبار پەیدابین
بەری دەست پاڤێن و ژوردا بچن
بەرێ خۆدان دوچاڤێن دلبەرا من
هینگێ رویبار هوی بین عشقێ
عشقا دەریایان
هندەک ژ رەنگێ دەریایێ دزین
هندەک ژ نەهێنیێ یێن ئاڤ رابینا
ژ هەردو چاڤێن شرینا من
بخۆ برن
* * *

جیهانێ نەدزانی بشکور چیە
حەتا رۆژ ەکێ ژ رۆژان
خودێ گوهێ خۆ ددا دو زاروان
د ئاخفتن.. درەو بو ئێک و دو دکرن
ئینا بشکوری

بشکوراوی دادا.. دادا
گەهشتە جیهانا مە
هینگێ مروڤ هوی بین بشکورینێ
* * *

دەمێ ئێکەم دیوانا ئەڤینییێ
ل چاپ خانەکێ هاتە چاپ کرن
ئاگر بەربی هناڤێن چاپخانێ
ئێشەکا نەناس گرت
چاپ خانێ دەستێن خۆ
ل چاپەڤانی ئالاندن
راموساند
سحارێ
چاپەڤان دبەر چاپخانێ ڤە
نڤستی بی
و چاپ خانە .. بێ دەنگ و مت ببی
* * *

سحاری یەکێ داری یێ داران
هاتە ناڤ داران

بڤر لسەر ملی بی
لەرزەک کەتە لەشێ داران
گوتە وان
سوبەهی داوەتا کورێ منە
هین هەمی خۆەندییێن داوەتێ نە
دڤێن هوین بێن
سحاری یا رۆژا پاشتر
دارا خۆ خەملاندن
دا بچن داوەتێ
داوەتا کورێ داری یێ داران
وەلێ رهێن داران
دار کێشان
نەهێلان دار ژ جهێ خۆ بلڤن
ئینا نەچون..
* * *

دەمێ گەمی دەست ب سەفەرا خۆ کری
گەلەک مروڤ ل سەر بانێ وێ بین
هندەک کەیف خۆش بین
هندەک پوسیدە بین

وەلێ کەسێ پسیارا دلێ گەمییێ
نەکر
ئەرێ دڤێت سەفەرێ بکت.. یان نە
ئەرێ کەیف خۆشە یان نە
دلێ من ژی هەر وەسانە
ئو هەر وەسابی
وەک دلێ گەمییێ
ڕۆژا من دلێ خۆ ناس کری
هەتا ئەڤرۆ
سەفەرا دکت.. وەلێ نە ب خو
تێتە دەراڤ و بەراڤان
وەلێ نە ب خۆ.

١٩٨٣

# ماست فرۆش

**پێش کێش بت بو هەڤالەکێ خۆشتڤی یێ کو ـ موخابن ـ جارەکێ ڤیا ماستێ خۆ بفروشتە من و کولاڤێ خۆ بکتە سەرێ من... وە دیارە ئەڤە ژی کارەکە!!**

بدۆشن
چێلا هزار سالی
چێلا پیر
مەنجەلوکێن ژنگار گرتی
بدن بەر
مەنجەلوکێن بێ بن
مەنجەلوکێن هزار کون
بدن بەر
چچکێن گوری

چچکێن چێلا پیر
بگڤێشن
بەلکو .. خودێ مەزنە
ژ وەرا بێتە خارێ
ژ زوخ و عەدابان
شیر
ب مەیینن
شیرێ ژەحرێ یێ تەحلو سیر
دەنگێ وە خۆش تێ
کازی بکن
ژبنێ پی یا قیژا ڤەدن
پێژن
ماستێ مهانە
ماستێ پەزانە
پەزێ «حەسویێ شڤانە»
بێژن هوین چ بێژن
بەلێ نەشێن
سەرتیکێ سەر ماستێ خو
ڤەشێرن
چونکی چێلا پیر

چێلەکا خفسە
شیرێ وێ کفشە
بنکێن چغارێن وە
دریخا وێ دا دیارن!
بێهنا ماستێ وە خویایە
تە ڤیا کولاڤی خو
بکی سەرێ من
ماست فرۆشۆ
کولاڤ گوهۆرۆ
هەڤالێ کویڤیانم ئەز
شەهرەرایێ مهانم ئەز
نێچرڤانێ سویخرانم ئەز
بەلکو .. خودێ مەزنە
بێهنا وەبێت
بازارێ ماست فروشان
ڤان رۆژا
پر ب رەوشە
گەرمە.. گەشە
شیر دۆتن
ماست فرۆتن

کولاف گوهارتن
کاره..
کارەکێ هاره
چێلا هزار سالی
هەر ئەوه
هێشتا ساخه
پر هێزه.. پر زاخه
بدۆشن
سالسکی یێ
ژ بنڤه بنڤه
خو گەهی یێ
کەرم کن
بمەیینن شیرێ چێلا پیر
بفرۆشنه من
مەنجەلوکێن بێ بن
مەنجەلوکێن هزار کون

١٩٨٤

# میرێ پەیڤان

**ژ سەیدایێ صادق بها ءالدین ڕا پێش کێشە ١٩٨٣**

ئەرێ سـیـلاڤ چمـا ئەڤـرۆ مـەلیل و هشک و زوهایی
کـەلێ بۆچی تـو بێ دەنگ و نەگـەشـدار و ڤـەرێل هایی
چرا دل تـو وەسـا ئەڤـرۆ ژ کـاکل ڕا یێ ئـارهایی
گـوتن یارۆ نێ کـەو رابو سـەفـەر کـێـشـا و زاڤـایە

تە دا ڕێ ئەی میرێ پەیڤان بێ ساز و ماز ل پێش تە بچن
شـاگـردێن تە هەقـە چووبان ب مـەوکب ئەو جلک رەش بن
هەتـا پەیڤـێن تە ژی سـەیدا ل ڤێ شـعـرێ دا ژی گـەش بن
غـەریبێ ڤێ ژیانێ بو شـەڤـا مـرنێ ژی هو مـایە

ژ واریێ بێ کەسان کەس بو ل باغی خرش ئەو پر بەربو
چ چاخەک بو وی دەست پێ کر کو کوردی هینگێ بێ سەربو
کەوک بو لێ نەچو راڤێ ژ کەوگەران نەکەو گەر بو
ب راستی (سادقی) لەورا دل ب ناڤێتە ئاڤایە

تە سینگ دا بەر رەشەبایان ب خزمەت چوویە ئەزمانی
مە هولێن تیژ چ جار نەشیان بکولن بەر دەرێ خانی
ژ توری ڕا تو دەرگەهـ بوی ب سوزی خوش زێرەڤانی
ب پیری ژی قەلەم گەش بو ئەوی خزمەت نە بەردایە

چ تاڤەک بو گەلۆ یا گەش ل چاخێ تاری و شەڤ رەش
چرابو ئەو ل بەر چاڤان هەلات و گوت ئەزم ئاتەش
ب کورمانجی گەمی داڕێ ل دەریایێ زمانێ خوەش
ژ پێش لەعلان وی پەیڤ گرتن نقوڤانێ مەکوردایە

مریدێ ڤینا زبنێ بو نەساخێ دەردێ مەمێ بو
روندکا تاج و ستێ بو فیغانا سیو خەجێ بو
خوش ڤیێ طاڤ و مژێ بو عەڤدال بو چاڤ هەر ل ڕێ بو
گەلۆ لەوڕا دسوژت دل کو جهـ کەو ئەڤرۆ ڤالایە

# یارێ

یارێ ئەو دو چاڤێن بەلەک مەژی یێ من پێ هندابی یە
یارێ ئەو دو چاڤــێن دەلال باوەری یا من پێ هاتـی یە

تاڤێ نەشــیــا خـۆ لبــەر بگرت ئینا گــوتن ئاڤـابی یە
یارێ سویندە ب کەڤر و چیا و کا بارنێ چەند باری یە

کــو ئەڤــینم هەر یێ دینم ئەڤــینا من یارســتی یە
یارێ ئەو پرچا تێـتـە خـارێ سـەر ئەنیـاتە ئەو بوچی یە

داپێ بکـەلـم داپێ ســــوژم هـویـە هویە نـەیاری یـە
گـەل خـو تینت دل و مـەرگـان ئەڤـینا من گـەل هاتی یە

یارێ سوینده ب کەسک و سورێ ل ئاسمانان دیاربی یە
ئەز کـــــوره مـــــە چ نـابینم ژیـانا مـن یا تـاری یە

یارێ وەره نـێـــــزیک ببــــــە هەبینا تە روناهی یە
ئەڤـــینا تە ددل بی کـــول مـن رێکا خـــو نەزانی یە

یارێ تە ئەز کرم شاعر مە پێکڤە ئەو گول چاندی یە
جـارەک گـوله و جارەک کـوله یـان دەشتی یو زوزانی یە

* موخابن ئەڤە هوزانەکا درێژ بی و من نەمایە ل سالا ١٩٦٦ من ڤەهاندیە.

# شاهينو

**ئەڤ هوزانە من ژ بۆ شەهیدێ نەمر جێگرێ سەروکێ پێک هاتی یا رزگار کرنا فلسطینێ خلیل الوزیر (ابو جهاد) دارشتی یە.. یێ کو ل تونسێ هاتە کوشتن سالا ١٩٨٨ێ.**

ئەز نزانم گەر تو دزانی!
تە گەلەک برا هەبین
تە گەلەک هەڤال
ل ڤێ دنێ هەنە
هندەک ژ وانا ئەمین
لێ ئەمێن «هندەک»
جودانە!!
ئەم خەلکێ ولاتێ دلستانێ نە

کوڤانێن وه
هیڤی و بیرەوەرێن وه
د کەهنی یێن مەدا.. دیارن
چاڤێن زاروکێن وه
دەستێن لاوێن وه
حەبسی یێن وه
سحاری یا
ئێڤاری یا
نیڤێن شەڤا
د ناڤ بەریکێن مەدا
پاخلێن مەدا
دلێ مەدا.. مێڤانن
سترانێن وه
د ناڤ بریسی یێن مەدا
کوبارن
* * *
ئەز نزانم گەر تو دزانی!
مه ستران بێژەک هەبی
ناڤێ وی سەعید ئاغا بی
د باکیا دلی

د میرانی یا خوٚ دا
ئاغا بی
ل سەر چیایێن بەیرویتا خوپان*
سترانەک ژ خوەرا دگوت
«ئەی ملکێ کوردا
چ بخێر و بێره
ئالەک مەعدەنە
تەڤ زیڤ و زێره»
سەرفەرازو
شاهینوٚ
سترانێن ڤێ دنێ
ژ بنیاتی را
سترانەکە
کەهنی یێن ڤێ دنێ
ژ بنیاتێ را
کەهنی یە کە
چونکی خودێ..!
ژ بنیاتی را
خودێ یەکە...
* * *

ئەز نزانم گەر تو دزانی!
شاهینۆ.. خورتۆ
بالندێن سەر سیڤاندێن مالا مە
شەرمەزارن
نەشیان بێنە بەهی یا تە
ل دۆر تەرمێ تە بلۆرینن
شەرمەزارن
لێ نەگرتنێ د خوازن
بالندێن مە
فرین ژ بیر کرینە
ژ مێژە نە فرینە
وەلێ چەنگا د هەژینن
سەروژنوی
رۆژ بو روژێ
هوی دبن فرینێ
* * *
ئەز نزانم گەر تو دزانی!
بەرێن وەلاتێ من
پێ گوتینە
ئەز دزانم

ل قودسا پیرۆز
داوەتا بەرانە
شاهی یا بەرانە
نڤێژا بەرانە
بلا بەردەقانی باخڤن
بلا قۆسکێن ددەستێ بچیکادا
چیروکا دیرۆکا دنێ بێژن
هاوارێن ژنان بەرن
گرێ یا بچیکان بەرن
دەڤێ زەلامان تژی بەرن
شاهینۆ
سەرفەرازۆ
من گوتە زەلامێن تە
هەڤالێن تە
گەر وە بڤێتن
تژی وارێ مە بەرن
بەرێن مە
پێ گوتینە
گەلەک هشکن
ئێک جار رەقن

هەر بەرەک ژ بەرێن مە
روژەکێ
زەمانەکێ
دلەک بی
وەلێ ژ عشقا درێژ
ژ هیڤی یەکا بێ دوماهی
دل بی بەر...!
* * *
ئەز نزانم گەر تو دزانی
یێن وەکی تە
سویارن
سیارێن هەسپێ راستی یێ نە
راستی هەسپەکە پر بەزە
هەسپەکێ بلەزە...
ل نیڤێن شەڤێن رەش و تاری
وەک گوللا تڤەنگێ
ژ دەڤێ برنوەکا نوی
ڤەرەستی
هەسپەکە
سمێن وی ژ عەردی ناگرن

وەک برویس یێ یە
وەغەرا وی ئەڤرازی یە
بلنداهی یە
ئەلندێ تێهنی یە
ئەلندێ ڤەکوشتی یە
سیارو ل جیهانا مەدا
ئەلندێن تێهنی گەلەکن
ئەلندێن تێهنی
سحارێ
ب خوینا زەلامان
زەلامێن زەلام
تێهنا خۆ دشکێنن
لەو ئەلند سورن
سیارۆ
شاهینۆ
تو ژ دلێ خورتان را سترانی
ئەز نزانم.. گەر تو دزانی!

١٩٨٨

# نۆژدارێ بـرینـان

**بۆ مەرگی پاکێ دکتور نافع ئاکرەیی پێش کێشە ب هەلکەفتنا بورینا سالەکێ ل سەر کۆچ بوونا وی**

ئەی بلیلێن دەست شـڤـانان مـا دبت بێ دەنگ بن؟
ئەی کەڤوکـێن سەر چناران ما دبت بێ چەنگ بن؟
ئەی سـیـارێ پێـلا ژینێ رێ چـمـا بەرزە دبـن..؟
مـە ژ خـودێ ئاهو دادان رۆژ بۆ رۆژ دل ژەنـگ دبن

رۆژ بـۆ رۆژ نـالـین و دەردە مـــــە ژ نـوژداران هـەوار
کی دێ سـاخ کت ڤـێ برینێ پەنجـەشـێـرو گـەزەمـار
گـــەر تـو نـوژدارێ برینای رابە ســـاخ بە بـرینـدار
چەند بـرینێن خـەلکێ ساخ بۆن لێ نەبۆ بۆتە چ کـار

ئەی سـیـاریَ رەش مـەهینیَ بەر پەسـاریَن ڤیَ دنیَ
خـوّش سیـارو جەرگـە هارو دیَ کـیـڤـە چی تو بتنیَ
روّژ کـەتە چاخیَ ئیَـڤـاران شـەڤ بلەز دل داژەنیَ
جـان کـولیلکا من فـەکـوشتن لەیلەکـا سـیـپـا منیَ

خـوّش هەڤـالیَن تە براوو چاڤ ل ریَنە خـوّ ژ پار
چاڤ دبارن لیَڤ بەیارن دل دهارن ب پسـیـار
قـەت دبت هەر تو ب مـینی ژ مـە دویر و نەدیار
سـیـسنا ڤیَ سـالیَ سـوّتن ئاکـریَ مـابو بیَ بهـار

مـە ژ میَـژە سـەر هەلاندی بوّ ئەلەندیَن پشت چیـای
چاڤـەنیَـرین هەر ئەو میَـرین ئاڤـا زیَرین کـەهنی زای
لیَ مـوخـابن ئەی براوو پیَش بەراهی بـانگیَ دای
تە نڤـیَـژا خـوّ ب لەز کـر ئەی نەمـاییَ هەر ژیای

پڕ ژتە ئـاکـریَ خـەریبـە ئەز دزانم ئەی برا
تو ژ ئاکـریَ را هەڤـال بوّی روهنی یو مـوّم و چرا
مـیَـهـرەبان و پر ئەڤیَن بوّی گـولاڤـا هەمی درا
کـەس نەمـا بوّتە نەنالت کـوشـتـییَ دەست ریَگرا

بنڤــه نوژدارێ برینان بەلكو ســاخ بت رەش برین
بەر سـها دارا ئومـێدان خـەوەكا خـۆش و شـرین
بنڤـه مللەت هەر یێ ساخـه مللەتێ جگەر ب خوین
بنڤـه سـەر عـەورێن روندكا ببارن خـۆشی و ئەڤین

١٩٩٢

# سرودا نەوروزێ

نەوروزە گەلی برا
نەوروزە هەلکن چرا
نەوروزە سالا نوی یە
بهارە ل هەمی درا

نەوروزە و گول بشکڤین
شالیلا خوش بسترین
نەوروزە ب خوشی بژین
نەوروزە پیروزبکین

نەوروز سەرێ سالانە
بیرهاتنا مێرانە
نەوروز ناڤەکی گەشە
کەلا دلێ لاوانە

* ئەڤ سرودە تەحسین تەهای سالا ١٩٦٩ ستراند. ئێکەم سرودە ل بادینا ب نەوروزێ هاتی یە گوتن. شعر درێژە وەلێ هند تێتە بیرا من.

## بێریڤانێ

بێـــریڤـــانێ مـــال وێرانێ
شـــرینێ وەی بێ خـــــودانێ

زەرکـــــا تە بـۆچی ڤـــالایـە
مـــەشکا تە بۆچی قـــەتیـــایە

پەزێ تـە بـۆچی یێ مــــتــــە
بەلاڤـــە ئەڤـــرۆ کت کـــتـــە

بێـــری یێ بێـــژە شـــڤـــانی
گـــــوه بـدە پەزێ خـــــودانـی

بێـــریێ بێـــژە بێـــری یان
ئەســـمــەر و جــان و زەری یان

نێـــــــزیـکـه ئـەو بـوهـار بـێـتن
ئـــەو بـــوهـــارا پـــەز بـــزێـــتن

بێـــری یێ ڤـــێـــرکـــه ســـتـــرانا
دا تـــەنـــاکـــین ئـــێـــش و ژانـــا

ئـەم ژ برسێ ڤـــــەت نـامـــــرین
ئـەم ژ ترسێ ڤـــــــایمـتـــــــرین

١٩٦٧

* تەحسین طاهای گوبتی.

# ئاسۆ

ئاسۆ ئەی هەوار ئاگر بەربی من
ئاسۆ چەرگ و دل تژی برین

هەردو چاڤ بۆچی هەر دەم گرینە
دەست و پێ بۆچی هەر دەم گرتینە

ئاسۆ ستێرەکە چ چار نا گەهمێ
ئاسۆ کوشتیمە ژ بەر ڤێ شەرمێ

ئاسۆ سترانە دلێ من لێدا
ئاسۆ کولیلکە ل ناڤ بەفرێ دا

ئەڤـینی ل نک مـە بۆچی یا شـەرمـە؟
یا ب ترســە گـەلەک ب ســەهمــە؟

ئەڤــرۆکــە دیســا وەکی دوهی یە
ژینـا مـن و تـە بـێـــــژە بـۆچـی یـە؟

١٩٦٧

* تەحسین طاهای گوتنی.

## برێسه

برێسه دلبەرێ داڤا
برێسه ژ جەرک و هناڤا
برێسه ژ رەوشا حەتاڤێ
ئومێدا ژینەکا ئاڤا

برێسه ژ دەنگێ نالینا
ژ برین و کۆڤان و خوینا
ژ بێهنا نێرگزێن ژوری
ژ دەنگێ زێمار و گرینا

تەشیا خۆ بادە شرینێ
برێسه ژ دەزیێن ئەڤینێ
ژ خەونا زاروکێن ساڤا
ژ ئەڤینا مەم و زینێ

١٩٧٠

* تەحسین طاهای گویتی.

# وەلاتێ ژێک ڤەکری

ئاهێن ناهێت ئەی وەلاتا ژێک ڤەکری
هەتا کەنگی تو دێ مینی لێک ڤەکری
مللەت گازکر ب دەنگێ شێرا ب چەک هەلگری
هیڤی دارین تاڤا ژینێ ب کەڤتە سەری

* ئەڤ هوزانە موخابن من نەمایە.. من تنێ ئەڤ چار بەیتە دناڤ کاغەزێن خو یێن کەڤن دیتن. من ئەڤ هوزانە سالا ١٩٦٣ێ هاڤینێ ل باژێرێ «دیوانیە» ڤەهاند، هینگێ ئەمرێ گرتنا من ژ (حرس قومی)یا ل هەڤلێرێ و بەغدا دەرکەتبی.من خو ل دیوانییێ فەشارت بی بابێ من ل حەبسا (مسیب) بو.

# شەرمنە دل

شـــــەرمنە دل دێ چەوا  شـــــەڤ چراکم  تاری یا
بو وێ بێـــژم هارو گـــێـــژم دل ڤـــەرێژم من ڤـــیـــا

مـــە ژ دل ئـیـــرو هەوارە پەنجـــەشـــێـــر و ژانە دل
کـــو کـــەتم ئـیـــتـــوینا ڤـــینێ سـوّتیـــو کـــوڤـــانە دل

شـــــرینێ نازەنینێ ئەم کـــــەتین دەردێ گـــــرینێ
رەوشـــەنا شـــوخـــا دلا «خـــانزادا» تەخـــتـــێ ئەڤـــینێ

عـــەمـــرەکێ دویر و درێژ مـــە ب ئومـــێـــدان وێ بری
یان ب ژان ویان ب ئوخ و یان ب ئاخ ویان گـــــری

شـــەرمنە دل هو گـــەلۆ ئەم کـــرین قـــاچا دەڤـــان
زێرەڤـــان زۆرن ئەو چمـــا نـانڤن رۆژ و شـــەڤـــان

تاڤی یێن بیـــرا دبارن هەی هەوار و ســـەد هەوار
کویڤی یێن عاشق خۆ کوشتن لەو دسوژت خوش بوهار

شـــــەرمـنـە دل دێ چەوا شـــــەڤ چراکم تـاری یا
بـووێ بێـــژم هـارو گـــێـــژم دل ڤـــەرێژم من ڤـــیـــا

ئەو بوهارا ل دێمێ رشـتـی لێ بەلاڤن لەعل و گـول
لەو دخـوینت کـەو ب سـۆتن هێـر وژانە ئەڤـرۆ دل

گـەر مـە زانی با تو چیی رەنگە دا بێـهنا مـە هێت
نە تورین و نەپەری یی نەمـــەیا مـــە ژدل دڤـــیت

ســـەد هزار تورین و پەری ببنە گـــۆری تە دەلال
چ مـــەیە ژلێـــڤـــا دبارت ب رەنـگەکێ ســـۆر و زەلال

تو دکـاروانێ رەڤـەندا سـەرکـێـشـا مـالانی جـان
کـو رەڤەند سینگ دا زۆزانا کر هەوار و لێ بی ژان

گوت خەتیرە یان چرایە شەوق ددت دەشت و چیا
ئەڤ بوهارە شەرمزارە ژ جانی یا چاڤ و رویا

شەرمنە دل دێ چەوا شەڤ چراکم تاری یا
بووێ بێژم هارو گێژم دل ڤەرێژم من ڤیا

نە خودێ یە گەر خودێ با رەنگە دا هیڤی هەبت
د مەحشەرێ دا بێمە پێشڤە چاڤ ب چاڤی دا کەڤت

شەرمنە دل هەی هەوارە لەرزە و ئەز دەڤ زوها
چەند دبۆرت خانما من شوخ و شەنگا پربها

زین و سەلوا دو پەری بون کرنە گازی وەی یەمان
ئەڤ چ جانە ئەڤ چ شوخە قیبلە رێکا شاعران

دێ هلون رابن ببینن تۆرینا بلبل ژێ دین
نێ وێ کێشان ژ دەروێشان رۆژی و نڤێژ و دین

سوسنا ژارا ئەڤینێ تو خودێ هاژێ هەبە
نازکن سوسن دلبەرێ دل رەق و بێ ئول نەبە

شـــــەرمـنە دل دێ چەوا شـــــەڤ چراکم تـاری یا
بـووێ بێـــژم هـارو گـــێـــژم دل ڤــەرێژم من ڤـــیـــا

دل بەیارە یێ بێ یارە وی ژ دنیێ مــــا شــــینەوار
یێ بێ وارە صــــەد هەوارە پڕ غـــــەریبێ برینـدار

ئەز لدەریایێن دو چاڤـان گـەمی مـە بێ گـەمـیـڤـان
باو بارۆڤ ژ گــەلی بۆن شـەڤــەکێ تاری و گــران

دێ چەوا گـەهمـە وارێ خـۆ ئەز بیـانی و بێ خـودان
دێ وەرە تـو بکـە هاری ڤــــان پـەپیـکێـن چ نەزان

شـــــەرمـنە دل دێ چەوا شـــــەڤ چراکم تـاری یا
بـووێ بێـــژم هـارو گـــێـــژم دل ڤــەرێژم من ڤـــیـــا

کـو دلبـەر ئیـرۆ گـرنژی مـە هومـێدەک ب خـو، چاند
گـومبـەدێن شعـرا بلندبین چیچەک و شـالیلا خـاند

زەنگلێـن زێرا د ژەنن گــــاڤـــــا تورینێ کــــەنی
دەنگ ڤەدا خوشی یا دلێ من، شعر و پەخشان ژێ ژەنی

سینگ و سینگ چۆمە نڤێژی بدلەکێ سۆتی وکۆڤان
مە ژ خودێ خازەک خاستبی ئەو بیّری باو ئەز شڤان

کی دێ هێت لۆکا  تە یارێ کەهنی یا شعرانی تو
کەو ژێ مەستە لەو دخوینت گەرمە و زۆزانی تو

١٩٧٥

# دەمێ بیر دێنە بیرا من

**(١)**

دەمێ بیر دێنە بیرا من

پەیڤ.. هزر.. هیڤی

درەڤن

قەلەم تیک دبن

کاغەز ددرهن

تلێن دەستێ من

دبن ئاسن

چ ناگرن

نانڤێسن

نانڤێسن.

**(٢)**

دەمێ بیر دێنە بیرا من
مرۆڤ.. هەڤال.. برا
خو ددزن
عەورێن ئەسمانا
بەلا خو ژ خۆ ڤەدکن
ل چیرۆکا بارانێ لێڤەدبن
رویبار رادوەستن
بێهنەکێ...
پاشی رێژا خۆ دگوهرن
سەرئەڤراز دچن
پەشێمانێن بەفرێ نە
پەشێمانێن دەیکێ نە
وەلێ دەیکا بەفرین
ژ خەریبی یان
ژ چونا کورێن رویبار
نەمابی..
دەنگێ تاڤا گولانێ هات
تژی گوهێ من کر
شاعرۆ..

دەیک لڤێ دنێ
دحەلن.. دبن ئاڤ
دبن روبیار
دبن سیلاڤ.. دبن سیلاڤ.

**(٣)**

دەمێ بیر دێنە بیرا من
نسرین.. بەنەفش.. نێرگز
دکوزرن
سەیرانی سەیرانێ بەرددن
گەمی یێن ئومێدان
رادوەستن
ل نیڤا دەریایێن فرەھ
دناف رهێن خوینا من
بێ ئارمانج ل دور خۆ
د زڤڕن
باهوز و بابەلیسکێن زەمانی
د قەرسن
سکرێن هیڤیا
ژ لیساڤێن[١] بەفرا کویڤی

د هەڕفن
بەرێن سكرى
د هەڕشن
شەڤ خەما گران
مەهينا منە
ئەڤينا منە
سەيرانا منە.. سەيرانا منە

**(٤)**

دەمێ بير دێنە بيرا من
سيلاڤ .. باران.. مژ
بار دكن
زوها دبن
ترسەک دكەڤتە دلێ سيلاڤێ
ئێشەک دگەڤتە لەشێ بارانێ
مژ هاردبت.. بلند دبت
پيچ دبت
نە ساهى يە
وەلێ نە عەورە
نە مژە

بیرەکا تیژە
مەژی گرە
خەنجەرە
مروڤ کوژە
بیر ژ کوشتنێ نەخوشترە
خەنجەرەکا ژ ناڤ رایە
لێدانەکا هارە
لێدانا هارایە
لێدانا ئارهایە
طاڤا گولانێ بیر ئینات بیرا من

(٥)

دەمێ بیر دێنە بیرا من
کەیف.. کەنی.. بشکور
هشک دبن
سەر کەڤرێن لێڤادێنە سێ دارکرن
بلند و نزم
سار و گەرم
بەلا خۆ ژ ئێک ودو ڤەدکەن
ژان دکەڤتە رهێن دارا

عەرد پێ تێشت
شیناتی یا ئەسمانی
عشقەکا کەڤنە
وەلێ شیناتی چو
شینی ما
ئاسمانێ بێ رەنگ
ژ خوەرا و عەردێ ژاندار
ئاخینکا دکێشت
ئاخینکا دکێشت

**(٦)**

دەمێ بیر دێنە بیرا من
خوشی.. خەیال.. خەون
نامینن
هەمی دەستێن ئاشق و یاران
ژێک ڤەدبن
هەمی کەلێن بەنەڤشا
د هەرفن
چیچک دبنە سیمەرخ
کەهنی دبنە دەریا

روندک دبنه پێل
ئەنی دبنه سێل
چاڤ جهێ خۆ بەرددن
ل ئەسمانێن سەردنێ
دگەڕن
خودێ وو ل ته دگەڕن
بەلکو ته ببینن
ئەسمان تێکڤەدان
عەرد نەهێلان
وەلێ ته نابینن
گەلەک دویری
خودێ وو خودانێ ڤێ دنێ
هو چێکەرو
چێکەرێ چیرۆکا کەڤن
دانەرێ خەونا مەزن

١٩٨٥

(١) لیساف: بەفرا حەلهای ل بەر طاڤێ.

# هەرسێ لێدانێن دلێ من

**(لێدانا ئێکێ)**

من گوته بچویکەکێ ساڤا
بکەنە
گری
بکە گری
کەنی
کەتم هزرا
ئەڤە من چ گوت
ئو وی چ کر
دیارە بچویکە.. لەوا
بچویکن ئەڤان مەژی خاڤا
لێ کەڤوکەک ژ دویر

ژ هنداڤا
خواند.. ستراند.. گوت
شاعرو
هزرێن خۆ نەکە
ئەو ڕاستە..!
کەنی یا ب فەرمان بت
گری یە
کری یا بفەرمان بت
کەنی یە
دورستە بچویکێ ساڤا
چاڤ روهنە
مەژی تەرە
هێشتا یێ پاکە
بچویکێ ساڤا..!!

**(لێدانا دووێ)**

من گوتە سویارەکی
پەیا نەبە

را نەوەستە
ڤان دو قەسێن من
بگەهینە دلبەرا من
دلبەر سلە
سلە ژ من
سویارو ئەز دزانم
تو و هەسپ دێ تێهنی بن
رێ دویرە...
ئەڤرازی و نشیڤن
هەسپ کەنی
گوت
ئەڤە ستویێ من
بلا سویار ڤەخوتن
گەر تێهنی بی
بلا ڤەخوتن خوینا من
دل خوش بە.. کاغەزا تە
دێ گەهت
گەر ئەزو سویار نەگەهشتین
دلبەرا تە..
دێ هەردو قەسێن تە

خوینتن
لسەر کەڤلێ من
لسەر زینێ گرێدای
سەر پشتا جانیکا من

## (لێدانا سیێ)

من گوتە پیرەمێرەکی
پیر نەبە
راوەستە
من هیڤی ژ تە هەیە
نەمرە
تژی دەستێ نەڤی یان
ئو نەڤی چرکان
نێرگزن
دونیا ژ نێرگزا
مشتە
ها.. ها دێ هێت
ببینە.. بەری چونا خو

ببینه کاکلا ژینا خو
گوت.. مامو
من ژ مێژه دیتی یه
من خەونەک دیتی یه
سالەک دێ هێت
ناڤێ جیهانا مه دێ بته..
نێرگز
پەیڤێن ئەزمانێ مه دێ بنه..
نێرگز
ئەم دێ نڤێژا خوّ کین..
لسەر شەملکەکا پر
نێرگز....
هو مامو
من خەونەکا دیتی و ئەز دزانم.. ئەز دزانم

١٩٨١

## کوردینی یا کوردەکێ بێ ناڤ

کوردینی یا وی
ئاهێنەکە
سلاڤەکە
خوناڤەکە
بێ رویمەتی یە
بێ سالسکی یە
کوردینی یا وی
بێ دەست ماچی کرنە
بێ حرحرە
بێ گەفە
متە
هشە
خوینە

دلە
ستێرە
سترانە
دەرزەکە ل پیێ بچویکەکی یە
بەچکە شێرەکێ یە
کورێ شەهیدەکێ یە
پیێ پێ خاس
بێ باب و بێ کراس
کوردینی یا وی
روندکەکا کەلی یە
ژ چاڤێ پیرە مێرەکێ هەشتێ سالی
هەلی یە
باری یە
ل سەر تەرمێ کوری
لەشێ ژێک ڤەکری
دخوینێ دا دگەڤزی
کوردینی یا وی
کوردینی یا وی

---

* سوپاس بو کاک زەکی خورشیدی پێ کو هندەک ژڤێ هوزانێ بو من ژ سویدێ هنارت.. ئەوژی هند تێتە بیرێ.. ئەڤ هوزانە ل ١٩٧٢ێ من ڤەهاندبی.

# چراییێن وەلاتی

ئەی چراییێن ڤی وەلاتی سەد سلاڤ بووە ب دیاری
ئەڤ سلاڤێن کەڤنە دوستا ئاگرن تێن ب هەواری
هین د ئێتینا خەباتێ دار کەڤوتن ئەی برا
هین خەتیرن هین بزوتن هین دسوژن هین چرا

---

* ئەڤ هوزانە بەری٣٥ سالا من پێش کێشی کونگرا ئێکەتی یا قوتابیێن کوردستانێ کری یە لێ موخابن هەمی نە ل بیرا منە
* سوپاس بو کاک زەکی خورشید یێ کو ئەڤ پارچا هوزانا من لبیرێ بی و بو من ژ سویدێ هنارت.

# دیجله

هەمی شاعرێن بەغدایێ
هوزان ب دیجله گوتینه
غەزەل و پەژن ژێرا خاندینه
وەلێ کەسێ پسیارا خو نەکری یە
دیجله کچا کێ یە
خودێ ل کیڤە دایە
ژ چل سالان ئەز گوهێ خو ددم شاعران
کەسێ ئەڤ پسیارە نەکری یە
ئەز چومە دەراڤا دجلەی
من پسیارا ئاڤێ کر
من گوتێ..
دیجله یا لار و لەنجان
شوخ و شەنگێ
زیڤاڤا تێتە خارێ

رەخەک لەعلە
و رەخەک مەرجان
ئەی رێڤێنکا ژ دویر هاتی
د پاخلا تە دا
وێنەیێن.. جزیر و وان
ل بن شیتکا تە دا
پارچەکا کەڤنار
ژ دەرسوکا
میرێن بوتان
شێخێن پیران
ئەی دیجلا جوان
ل سەر نەخشا وەلاتێ دلستان
هوزانڤان ب جوانی یا تە پر گێژن
وەلێ نفش و نژادێن تە نا بێژن
گوت..
هەی هو.. برا
ژێ بگەرە .. چەوا بت بلا
نەینە بیرا وان
ئەز رێڤێنکم
بێ پێناس وبێ پەسەپورتم

ئەو جهێ خودێ ئەز لێ دایم
دائیرا نفوسێ لێ نینە
قەلەما ل دوکانا نافروشن
نەخاندن و نەنڤێسینە

١٩٩٢

# خەونەک

گەر تاری یا شەڤان
دو چاڤ پێڤە بان
گەر گرانی یا رۆژان
چەنگ پێڤە هاتبان
نە نڤستنا من
بێ خەوی یا من
هشیار بونا پالدای
دناڤ هەردو چاڤێن من
دنگێنا میر کوتان
بڤر و چەکیچان
ناڤ بەینا گوه و بالیفکا من
هەمی پێکڤە
خو لێک دابان

چوبان.. دلو.. چوبان
ب مێڤانی
ژ زیندانا بەغدایا خوپان
دەرکە تبان
فری بان
چوبان دەر ئاڤێن خابیری
سلاڤەک ژ مەرا بربان
گورێن باب و باپیری
لێ فەلەک
هەی «نزانم چ بێژم» فەلەک
بوچی .. ئەرێ بوچی
هەڤالێن مروڤی
ل مروڤی دبنە دوپیشک
پاکی
خوشی
کەنی
قەنجی
ل مروڤی دبنە کێچ دبنە رشک
ئاخ لێ فەلەک
بریندارم گەلەک

بوچی دچاخێ مەدا
مشک دبنە مێرخاز
بوچی «جوغرافی یا»
دبتە تەرازی
چەوا تاوان بار
دبنە قازی؟!

١٩٩٧

# ئەرێ بوچی

ژ تێهنا گەنجاتی یێ
ل سالێن ڤەکوشتی
بەر قیبلەیا هیڤی یان
من روحا شرین کرە رێ
دل و هناڤێن خو
من کرنە پێ
ئەز سەر وێ رێکێ برێڤە چوم
من گول دەنگێ روحا خو دبی
«بهێرە دستار بهێرە»
«خەمێن مە گەلەک گرانن»
من گول دەنگی روحا خو دبی
بن پێن من ڤە دکر هەوار
«بێژە یارێ بپێژە»

«بپێژە و بەرا پێ بێژە»
ئاخ و ئوخێن رحا بریندار
تژی گوهێ من کرن
وەلێ من دگوتێ.. بلا
«بلا بلا چ بێژت»
«بلا دلێ من بهێرت»
بلا ئاخ و ئوخێن مەبن
نەێن کورێن مەبن
نەێن نەڤی ێن مەبن
بلا ئەم بین ل زیندانان
ل سەر سێ داران
بلەیزین .. و دلەیزین
نەکو بچیکێن مە بێنە فروتن
کچێن مە بدەڤ و لێڤێن شین
بێنە دوتن
گەلو.. بوچی
ئەرێ ..بوچی
ئەو «بوچی» بی کوتر
من ب هەردو دەستان ڤەگرت
گوتە من تە دڤێت بزانی بوچی

من گوتێ ئەرێ
بوچی زەمان کورە دبت
بوچی جھ دین دبت
بوچی دار ل جهێ مە
ب خو تێنە هلکێشان
بوچی خزرێ زبندە
ل دەراڤێن مە دیار نابت
کوترا دەلال
چەنگێن خو ڤەقوتان
گوت، ئەگەر گورگ بین کوتر
بەراز بین ئینسان
ما بوچی جھ دین نەبت
ما بوچی کورە نە بت زەمان
ما بوچی دار ب خو .. ب خو
نەئێن هلکێشان

# کوتروک

کوتروک هاتو ژ دیرڤە
کەنیا خوشیا بدەڤیڤە
خودێ کوشتم ڤی کەنی یێ
برین کویرە ژ ئەڤینی یێ

* * *

کوتروک هات و ژوێڤە
خودێ چ چاڤن پێڤە
سوتم کوشتم ڤان چاڤا
هەمی وەختا و گاڤا

* * *

هندەک تێنە ڤێ ژینێ
پر ب خوشی و ئەڤینێ
هندەک تێن و بنەزانین
دێ هەر مرن بێ نەزانین

* * *

خـــــــــودێ تـو بـوچـی وەدکـی
مـــا ئەڤـــە کی یە و ئـەڤـــە کـی
خـــــــــــودێ لـەو بـریـنـدارم
ئـــەز دێ ژڤـــێ ژیـنـــی ژ بـــارکـم

* * *

دەردێ دلان گـــــــــــــرانـە
پـر ژ خــــــەمــــــان و ژانـە
مــن هــاوار کــــــــــر یـەزدانـە
گــــــوتی کـــــوتروک دەرمــــــانـە

* * *

* من و هەڤالێن خو ل کولیژێ ئەڤ هوزانە ل گەل سرودان بخو دگوت وەک برا سـەیدا هاشم تەها ئاکـرەیی و عـدنان مـوسی و رزگـار جـمـال و سـعـیـد بەرواری. مـخابن هەمی بدورستی ناهێنە بیـرا من. دبت بەلێ ئەز نەبشت راستم ئەڤە ئێکەم هوزانە من ڤەهاندبت و بو برادەرا خاندبت..١٩٦٢ یان ١٩٦٣.

# دو خەون

**(١)**

شەڤەکێ
زین هاتە خەونا من
گوت برا
وەخێرە..؟
هون گەلی شاعران
هندە ناڤێ من تینن!
د عەردو عەسمانادا
دگێرینن!
هو.. کەکو.. برا
نە کو یا ژ وەڤە
بێ ئاگەهین
یان مە ها ژ وەنینە
ئەم دزانین هون چنە

لێ بەلێ
ئەم دزانین ئەم کینە
ئەم ب خو ئەڤیندار بوین
ئەم چیروکەک بوین
ناڤێ وێ مەم و زینە
خودانێن خۆ و بەکروکەک بوین
وەلێ هون ئەڤرۆ
هەمی بەکروکن
بەکروکێن خونە
دەڤێ وە پر ب خوینە
چ ئەڤیندار
ئەڤیندارکێ راست
د ناڤ وەدا دیار نینە
لەوا برا..
گەلی شاعران
دلێ وە ب مەڤە نەمینت
دلێ مە ب وەڤە مایە
پوسیدە و پر برینە
ئەم د مەندەهوشین
ژ چیروکا چەرخێ بیستێ

چیروکەکا درێژە
نە مەم تێدا مەمە
نە زین زینە
ئەڤینی د باژێرێ وەدا
پەیڤن
بێ رحن
درەون
بەرن
مرینە
لەوا شاعرو
دلێ مە ژ وەرا
کۆڤانە
پر ئێشە
پر ژانە
هەر ب نالینە..

**(٢)**
شەڤەکێ
خەج هاتە خەونا من
گوت برا

وە خێرە..؟!
هون گەلی شاعرا
سترانا .. هوزانا
ب من دبێژن
روندکا
ژ من و سیابەندی را
د رێژن
ئاخینکا بەرددن
دەستا لێک ددن
چرا بەحسێ مە ب دورستی ناکن
سیابەندێ مێر
کارەک کر
بێ وەج.. بێ خێر
کەتە دویڤ پەزێ کویڤی
بکوژت
شەقاندن ئەڤرازی
بوراندن نشیڤی
لێ بەلێ
پەزێ کویڤی
هاژ مە نەبی

هاژ یارا خوەبی
لەوا.. لەوا
ئاڤ ل مە بو ئاگر
نێرگز بونە بڤر
ژ گونەهێن بێ گونەهی
کەلەم بو خەنجەر
چو د سینگی ڕا
سینگێ سیابەندی
سیابەندێ ئاشق
ژێ هەل دراندی
من خۆ لدیفدا هاڤێت
سەر کەلەخێ هلاویستی
داوە شاندێ
جەرگ و هناڤێن من
چەپ و راست پەرتاندی
رحا شرینا ئەڤیندار
رحا خۆ یا ئاشق
هو بساناهی
کەلەمی ستاندی
کەس نەبی بو مە بگریت

وەلێ من دیت
پەز کویڤیێ بریندار
ژ وردا بەرێ خۆ ددامە
خودێ و ..!
شەرمەزارم
شەرمەزارا پەزێ کویڤی مە
دەمێ ژ من وسیابەندرا
روندکەک وەراندی!!
ئەو کەلەم مارە..
هێشتا ل وێ نهالێ یە
ئەژدەهایە
وەک گورگەکێ هارە
دەڤ بخوینە
شاعرو چ نەخوینە
بێژە شاعران
شاعرێن باژێرێ خفسێ
دەڤی ل خۆ زوها نەکەن
هوزانا نەڤەهینن
نە خوینن
چونکی هین نەهینن

قەلەم نڤشێ کەلەمی یە
گەر نەشێن
دو قەسێن راست
سەر کاغەزەکا پاک
برێژن
گەر نەوێرن
سترانەکێ ژ دل
ژ بەزێ کویڤی را بێژن
ژارو پەزو
ڤەکوشتیو
ئاشقو
بێ گونەهۆ
گەر شاعر نەشێن
ب پەزێ کویڤی یێ ژ مێرا مێرتر
دو بەیتان بێژن
بلا قەلەم بچن ناڤ بەریکان
گەر داری یەک نەبت
داسەکێ ل بنێ کەلەمی بدت
ژ بنی را ببڕت
گەر قەلەم نەبت

بێژت سیابەندی
حەرامە کوشتنا پەزێ کویڤی
کرێتە کوشتنا پەزێ کویڤی
زنایە کوشتنا پەزێ کویڤی
ل بهارا عەشقێ
گەر قەلەم نەشێن ڤێ بکەن
قەلم هەمی د بێ نڤێژن
هەڕمی نە
نکل قرێژن
بێ نڤێژن
بێ نڤێژن

١٩٨٠

# ئەز ژ دل بۆ دل دنالم

ئەز ژ دل بۆ دل دنالم هێشتا یێ سەرخوشە دل
چیچەکێن کێرەی دنالن هێشتا یێ خازنوشە دل

ئەم دئێتوینا ئەڤینی هەر دسوژین چەند بژین
زی کەتین بەر داس و بڤران ئاخ و ئوخ و دل بخوین

لەو د ناڤ هزرا دگەڕهم بۆ بەحشتا هیڤی یان
ژێ هەل و ژوردا مە شەقاند ئەم ژ رەنگێ کویڤی یان

بەختەکێ لەنگ و چەپەل بو، بو هەڤالێ مە ژمێژ
کۆسپەنە رێکا مە یارێ وتاری یە ژینا درێژ

* ئەڤ هوزانە هوزانەکا درێژ بی بەلێ موخابن بەرزە بی و هند تێتە بیرا من.

# سەرێ ڤێ سبێ

**پێش کێش بت بو کچا من زوزان**
**ژ بو چونا وێ بو لەندەن بو خاندنێ**

سەرێ ڤێ سبێ
بەرێ خەزالا من کەتە دەشتا سلوپی یا
واللە دەلالا من تو نازک و نازداری
تو نەژ رەنگێ ڤان ئێش و نەخوش یا
بەلێ چبکم فەلەکا من ژ مەرا نەبی هەڤال
واللە لمن بیە گورگەک ژ گورگێن برسی یا
وەی لو لو لو لو لو لو
وەی لێ لێ لێ لێ لێ لێ
سەرێ ڤێ سبێ
خەزالا من بەرێ خو دایە دیار بەکرێ
واللە من گوت دیار بەکرا خوپان ژمن دیرە
دیار بەکرا خوپان ما دزانی سبەیا ڤێ سبێ
مێڤاناتە کی یە

مێڤانا ته ژ فەرەشینێ نازکتره واللە ژ شەکرا
قەندێ ژ من را شرینتره
خەزالا من رۆژێ سێ جار دهاته دلێ من چەرێ
بەلێ چپکم فەلەکا من ژ مەرا نەبی هەڤال
واللە لمن بیه گورگەک ژ گورگێن برسی یا
وەی لو لو لو لو لو لو
وەی لێ لێ لێ لێ لێ لێ
سەرێ ڤێ سبێ
واللە دەلالا من قەستا ستەمبولا شەوتی دکت
ئەرێ گەلی عەورێن سپی هنداڤ بەحرا وانێ
گەلی تەیر و تەوالان بەختێ وە و خودێ دا
دگەل پورا من پێش من ڤە هەرن
واللە پورامن عەزیز و نازداره
بەلێ چبکم فەلەکا من ژ مەرا نەبی هەڤال
لمن بویە گورگەک ژ گورگێن برسی یا
قەدا ب بەغدا خوپان بکەڤت و چنگێنا
زنجیرێن زبندانان دور دەستێن من و پی یا
وەی لو لو لو لو لو لو لو لو
وەی لێ لێ لێ لێ لێ لێ لێ لێ

١٩٩٦

# بێلا...

ژ کەلەکێن عەورا
عەورێن هزرا
من گوندەک ئاڤاکر
دوی گوندی دا من بێلایەک چێکر
ئەز چومە سەربانێ بێلایێ
و ژ بەژنا دلبەرا خو
من دار ئالایەک رەنی
ئالایەک ژ رەنکێ نێرگزان من پێڤەکر
من دلێ خو... دلێ خەم گران
کرە باگوردان
بانێ بێلایێ مە گێرا و .. و گێرا
وەلێ گەلو
دیسا هندە دلوپێن بارانا

تێنه خارێ
ئەز ژ خەوا گران راكرم
ئەز هشیار كرم
كانێ گوندی؟
كانێ بان؟
كا دلێ من؟
هەلگرێ خەما گران
من پسیارا عەورێن هەڤال كرن
گەلو
كەسەک ژوه باگوردانەک دیتی یه؟
باگوردانەكێ ژ دل وچاڤان
ژ بەژنا جانان چێكری
گوتن بەلێ.. مه دیت
ژ سەرێ چیایێ هیڤی یان
گرێله دبی
كەته بنێ نهالا خەما گەلی یان
باگوردانێ ته قەت قەت كرن
هویر كرن
كرن تسبەح..
هزار تسبەح ژێ چێكرن

ل «سوپەر مارکتێ» تێنه فروتن
سرایه.. سرایه
سرایه ل تسبەحان
ب خودیکێن ترومبێلێن نوی توب ڤەدکن
بو جوانی
تسبەحێن ژ لەشێ باگوردانی چێکری
ب ترومبێلا ڤەدکن..
ئەمان ئەمان
دەردو یەمان
سوتم ئەمان
دەردێ گران

# مژه...

مژه...
مژه و خویساره ل  شیشا دلی
مژه وتاری یه
بێ هژمار دلوپێن هزرا بژالەنه
مژه .. وهندی چاڤێن من خو دکنه گەمی
ب بزاڤی
هندی دکن و ناکن
ناگەهنه وی ملی
ناگەهن... ناگەهن
ریبار هاره
شیلی و شەرکەر و سوباره
ریبارو...
ئەز دزانم مژه.. تاری یه
وەلێ دلێ من هەر ئەو دله

کەڤوکە، کەوە، ئاشقە
ریبارو..
ژێ بگەرە ببورت
دلێ من ئیشی یەکا گەنمی یە
ل بهارەکا درەنگ
پر بژە
مژە وخویسارە ل شیشا دلی
بلا شالوکێن ڤێ دنێ
پتر و پتر تیژ ببن
بلا بێنە سەقا کرن
هەی زەمان
ئیشی یا من ل دادگەها دلستانێ
ب دروینێ هاتە حوکم کرن
وەرە شالوک
من هیڤی ژ تە هەیە
هندی ژتە بێت
تو ب جوانی.. ب نازکی
ئیشی یا من.. دلێ من
ژێ ڤەکی
ببرە شالوک ببرە

بکوژە وەلێ نەئێشینە
بکوژە.. بکوژە
مژە.. مژە
مژە و خویسارە ل شیشا دلی
ئاسنگەرێ شالوکان
نەدوستێ ئیشی یانە
نەیێ دارانە
نە چ تشتێ ب ژیانە
نەیار و دژە..
شالوک ب جەرگێ من
تێتە سەقا کرن
تیژ و خوش کرن
بەلێ پا مخابن.. چبکم
داستان لڤێ ژیانێ
درەنگ تێنە تێگەهشتن
مخابن.. گەلەک مخابن
هندە جارا
نائێنە تێگەهشتن
هەتا کو نەئێنە کوشتن
نائێنە تێکەهشتن

مژه..
مژه و خویساره ل شیشا دلی
مژه هوژیانێ
داڤه بەینا مان ونەمانێ
ئەز دزانم مژه
وەلێ نەترسه
هیڤی دارم نەترسی
هو ژیانێ
بەفرا ترسێ
ژ سەربانێن چەرگ و دلان
راده..
کاروانێن خەما
بلا ژ ناڤ بیبیکێن چاڤێن ته
باربکن
مژه وەلێ ب گرنژه
ئەز دزانم خویساره
رێ بێ سوزن
بێ یەمان و ئالوزن
خویساره.. نه دیاره
خو بگره

ژێ برێ ڤێ دنیایێ
میرێ مان و نەمانێ
خو ل مە بگرە
جەلەبا ل ڤی ملی
شڤان ل وی ملی
ریبار شێلی و هارە
پەز ژ سرێ
خو دایە ئێک
سەر نەدیارە
شڤان ل وی ملی یە
بریندارە
پەز ژارە و شڤان بێ کارە
مــژە..
مــژە..
مـــژە..

١٩٩٨

# ئەم هاتین

**کور:** دلبەرێ ئەڤرو ببینە
بهارە کەسک و رەنگینە
کەس نەما نەچو سەیرانێ
تو خودێ وەرە بلەزینە

**کچ:** ئو لاو وەرە ببینە
دلێ من بهار لێ نینە
کا بێژە کینە سەیرانی
تو ب خودێ کانێ ئەو کینە

**کور:** ئو یارێ خەما برەڤینە
ئەڤروکە ژین یا ب ئەڤینە
سەیرانی هەمی وەکی مە
دنیایە، خوشە، نارینە

**کــچ:** بهـــــاره یان ژی هاڤــــینه
دلـێ مـن تـێـكـدا بـریـنـه
بـهـــــاره وەكی ته دبینم
تو ب خـــودێ نه چه بمینه

**کور وکچ**: ئەم هاتین هاتین ئەم هاتین
ئەی بهار گەلێک ئەم هاتین
ئەم هاتین گەل ئێک ئەم هاتین
نەخوشی یا ب خو چێ ناکین

۱۹۷۰

* تەحسین تەهای و گولبهارێ ستراندی نە.

# ئەز ل دەمەكێ دگەرم

رۆژێ هەمی یێ
ئەزێ ل هیڤی یێ
رۆژ ئاڤا ببت
گاڤا شەڤ لمن دبتە مێڤان
ئەز پێڤە دمینم بار بکت
ئەز ل دەمەکێ دگەرم...
بلا گەلەک کورت بت
وەلێ شەڤ و رۆژ لێ نەبن
سەعەت لێ شەهرەزا نەبن
چونکی ب رۆژ..
گوهێن من و هەردو چاڤێن من
ژ نەخوشی یێن زنجیرێن دیمەنا
ژ گورزێن سوحبەتا دگەل خو

خو ڤەدشێرن.. درەڤەن
دچنە بن هەردو پێن من
چونکی ب شەڤ
هیڤی و بیرێن من
دبنە چەکچەکیلە
کۆرکانی تێنە من
ئەز ل دەمەکێ دگەرم
نە رۆژ بت نەشەڤ
نە سحار بت نە ئێڤار
نە چون لێ هەبت نە هاتن
نە ژ وردا بت نە ژێهل
نەراست بت نە چەب
ئەز ل دەمەکێ دگەرم
تشت ناڤێن خو نەئێخن
خو نە شەلینن
تشت بناڤێ خو بێنە گازی کرن
کوتر کوتر بن
تاژی تاژی بن
شالیل شالیل بن
بەراز بەراز بن

مه مه بن
گورگ گورگ بن
جامێر جامێر بن
دز دز بن
کورد کورد بن
گەلو
هندەک هەمێ ژیانا خو
ب هیڤی یەکێ د بورینن
بو دیتنەکا راست
بو بهیستنەکا دلی ژ دل خاست
گەلو ئەز بو دەمەکێ دگەرم...
راستی راست بت
خوزی ێن بەرێ
بەرێ.. بەرێ.. بەرێ
سالا ئێکێ ل مەکتەبێ
راستی راست بی
ئێک و ئێک دبین دو
دو ژ ئێکێ بتر بی
سەد ژ ئێکێ پتر بی
ئێک ژ ئێکێ چوبا دبی هیچ

ئێکێ ل ئێکێ بدی دما ئێک
نهو مخابن وەنینە
ئێک و ئێک نا بنە دو
دبنە هیچ
ئێک ژ دوا مەزنترە
ئێک ژ سەدا پترە
ئێکێ ل ئێکێ بدە
دبتە مەلیون
پاشی
دبتە هیچ
ئەرێ.. هیچ

# بەرقی یەک بۆ دلبەرێ

ژ شاعرکێ کوڤان
بۆ دلبەرەکا جوان
هندەک ژ ماموستایێن تە
ژ حەکیم و لوقمانێن تە
ژ دختورێن تە
نیڤێن شەڤا
پەرێن سویخرا بخوڤە دکن
بەردێن تە
و مروڤێن تە
و براو پسمامێن تە
لێ رۆژا پاشتر

ل چايخانا
ل يانا
سويندا ب سەرێ تە دخۆن
سەرێ ڤێ دنيايێ
بسابينا تە دشۆن

١٩٨٤

# ئاخ دلێ من

ئەڤــــرۆكــــە هاتە بیــــرا من
ئــــەز نــــزانم بــــۆچــــی دلــــۆ
خـۆشی و نەخـوشی یا ژینا من
ئــــاخ دلــــێ مــــن ئــــاخ دلــــۆ

هاتە بیــــرا من ئەو خـــــەون
ئــــەز نــــزانم بــــۆچــــی دلــــۆ
ئەو خــۆزی و هیــڤی ێن کــەڤن
ئــــاخ دلــــێ مــــن ئــــاخ دلــــۆ

ســــیــــلاڤــــێن بیــــرا دبارن
ئــــەز نــــزانم بــــۆچــــی دلــــۆ
روندک و گــــری و زێمــــارن
ئــــاخ دلــــێ مــــن ئــــاخ دلــــۆ

هەیڤــا من کــەتە پشت عــەورا
ئـــەز نـــزانم بـــۆچــــی دلـــۆ
کـــاژا من کـــەتە بەر بڤـــرا
ئـــاخ دلـــێ مـــن ئـــاخ دلـــۆ

* تەحسین طاهای گوتبی.

## سحارە

سحارە ل ڤان بلبلان
ناڤ رەز و باخێن گولان
روژباشان بۆ مە دخوینن
ئومێدا تێخن دلان

دا ساخکن ئێش و کولان
دا ئاشتکن دلێن سلان
سحارە بلبلا گۆتی
لێک بدن دەست و مالان

بلبل و کوتر و کەوان
راکرن خەلک ژ خەوان
سحارە خەوتن نەمان
بلبلا هۆ گۆتە وان

* سروودا سحارێ گولبهارێ گوتبی ١٩٦٨.

# سروودا دەیکێ

چاڤێ منۆ داوۆ گوری
سەر عەمرێ تە سالەک بۆری
دێ مەزن بی دێ بی زەلام
سەرفەراز و بێ غەم خۆری

چاڤێ منو داوۆ وگوری
سەر عەمرێ تە سالەک بوری

* * *

رۆژەک دێ هێت دێ مەزن بی
دێ چی خۆینی دێ زیرەک بی
سال بۆ سالێ دێ پێش کەڤی
دێ سەرکەڤی دێ ئێکەم بی

چاڤێ منۆ داوۆ گۆری
سەر عەمرێ تە سالەک بۆری

* * *

رۆژەک دێ هێت دێ بی زاڤـــا
خـــودان ژنو مـــالەک ئاڤـــا
خـــودێ بکت هەمی گـــاڤـــا
نـاڤ بلند بی ل نـاڤ ناڤـــــا

چـاڤێ مـنـۆ داوۆ گـــــــــوری
سـەر عــەمـرێ تە سـالەک بۆری
* * *

داوۆ گــــــۆری بکە کــــــەنی
رونـاهــی یـا چـاڤــێ مــنــی
پاشـــەرۆژێ ل هیـــڤی یا منی
دەیکا تە مــــە وکــــورێ منی

چـاڤێ مـنـۆ داوۆ گـــــــــوری
سـەر عــەمـرێ تە سـالەک بۆری
* * *

---

* گولبهارێ گوتبی ١٩٦٨.

# بنڤه بەرخێ

بنڤـــه بەرخێ بنڤـــه بەرخێ
خـــەو شـــرینێ و نازەنـینێ

بنڤـــه بەرخێ بنڤـــه بەرخێ
دەڤ کـــەنینێ هەی جـــانامن

بنڤـــه بەرخێ بنڤـــه بەرخێ
ئـەڤـین تـوی و نـاریـن تـوی

بنڤـــه بەرخێ بنڤـــه بەرخێ
ســیـــلاڤ توی ســـەیرانا من

بنڤـــه بەرخێ بنڤـــه بەرخێ
هیـــڤی و ئەڤین توی شـــرین

بنڤـــه بەرخێ بنڤـــه بەرخێ
نێــرگــز ژوری گــەش خــەملین

* گولبهارێ سالا ١٩٨٣ گوتیی.

## بێری و شڤان

**بێـری:** ئەز کـچم کـچا کـوردانم
کــولیلکا ســەرێ لاوانم
ریحــانا رەزو چەمــانم
لاوکــــۆ ئەز بێــــریڤــــانم

**شڤـان:** بێـریێ تـو خوین شـرینی
دەلالێ لێڤ هنگڤــینی
بشکوربە گـاڤـا من دبینی
بێــــری یێ ئەز ئـەڤــینداری

**بێـری:** لاوکـۆ ئـەڤـینی شــەرمـە
گەلەکا ب ترس و سەهمە
گونەهە ئەڤینی ل دەف مە
لاوکــــۆ ئەز بێــــریڤــــانم

**شـڤـان:** دەلالێ بەژن ریحـانێ
کـولیلکا هەیڤا گـولانێ
بزانە خـۆشـیـا ژیانـێ
بـێـریێ ئـەز ئـەڤـینـدارم

**بێـری:** لاوکـۆ هەرە مـالا مـە
م بخـازە سـاخ کە کـولامـە
تـو داوەت وئـەز ئـالامـە
لاوکـۆ ئـەز بـێـریڤـانم

---

* ئەڤ هوزانە بو جارا ئێکێ بشار زاخویی گوت دگەل گولبهارێ ل ١٩٦٨ێ، ل ئێستگەها کوردی یا بەغدا تومار کری یە دیڤدا گەلەکا ل کوردستانێ و ژ دەرڤەی کوردستانێ گوتن.
* موخابن هندە جارا ل تەلەفزیونا ، دەمێ ڤێ سترانێ پێش کێش دکن دنڤیسن (لە فولکلوری کوردی) ، کورو بابو هوزانا منە و ئەز هێش ساخم.

# ئەیاز

**پێش کێش بت بو بەهشتی ئەیازێ دەنگ زێرین**

چوخێ منۆ..
چوخێ تە ئەیازو
ژ هریا بەرانان
بەرانێن زوزانان
زەری یا .. ئەسمەران
پەریا.. رستن
روندک لێ رشتن
ب بەیبینان .. ب نێرگزان
ب خوینا بوهارەکا ڤەکوشتی
خەملاندن
تە پیروز بت
چوخێ تە ئەیازو

هەژارێ ڤێ دنێ
چەوا ئەڤرۆ...
شەهلیل ل وەلاتێ غەریبی یا
ژ تێهنا بلەز دمرن
زوی دمرن
چوخێ تە ئەیازو دلا ڤەهاند
ژ پەرێن کەوان
ژ بێهنا بنێن سێڤان
گول داین ل بوهارەکا
نەهاتی
ژ پسیارێن سەر لێڤان
بۆچی..!!
کەنگی..!!
چەوا..!!
تە بارکر بێ خاتر خازی
ژ نشکەکێ ڤە
د رۆژەکێ دا
د شەڤەکێ دا
هاوار.. مەکر گازی
دلو.. تەمبیر شکەست

بلیل تیک بین
مارێن رەش بۆچی
ب بیکا ئومێدا مە
ب سترانا هێش نەهاتی
ب سترانا د ناڤ چەرگێ
تاڤا سوبێ، گەستن
چوخێ منو..
سترانا تە بی
دەنگ زێرینۆ
خۆش نالینۆ
دلێ.. مللەتی
تەمبیرا تە بی
ئەیازۆ
ئومێد خازو
لێ چ بکم برا
چوخک تەنگە
دل پر پەنگە
روهنی یا چاڤێن مە
ئەیازۆ
موخابن دزێن شەڤان

زوی تو دزی ی
چوخێ تە ئەیازو
لبەر مەیە
سترانێن تە
لبەر مەنە
مە هەمی یا
داڤ داڤ عەزیزن
پەیڤ.. پەیڤ
دخوینن
دەنگێ تە هەڤالوۆ
پر زێرینە
لێ چ بکم؟
سیارو
رۆژ ل دیدارا تە
زوی ئاڤا بی
دونیا رەشە
بێ سوزە
شەهلیلێن ڤێ دنێ
ل ڤێ سوبێ
رابین... خاندن

پسيار كرن
كانێ ئەياز
كا .. دەنگێ ساز
چما ژ خەو نەرابی
لێ ئەياز چو
ئەياز تاڤەک بی
و ئاڤا بی
خەونەک بی
ژ خەونا بی
ئەياز
نڤست و
نە رابی
ئەياز..
ئەياز..

## ئاواز

تک تکا شیشا دلانی
بلبلا چەم و رەزانی
ئاوازێ بەژن ریحانی
ئاوازا ددکا شڤانی

١٩٦٦

* موخابن من ئەڤ هوزانە نەمایە، عبداللە دلسوزی ل هەڤلێرێ سالا ١٩٦٧ێ ساز دابو.

# بلا.. بلا

بـلا.. بـلا چ بـێـــــــــژت
بـلا دلـێ مـن بـهـــــــێـلـت
دوســــتـێ مـنـه ب ئـەڤـــیـنـی
خــــودێ بـو مـن بهـــــێلت

ســــال بـو ســــالـێ د بوریـنم
رونـدکـــــا ئـەز لـێ د وەریـنـم
خـــودێ دوســــتـێ من کـــانـێ
کــــــەنگی ئـەز دێ وی بیـنـم

دوســـــــتـێ مـن.. بـۆچی سلـه
دلـێ مـن ژ بـەر وی کـــــــولـه
بێـــــژنـێ ئـەزا رازی مـــــــه
ئـاگــــرێ ڤــــیـنـێ هـەر هلـه

دوســـــتـــو.. مــــانێ ته زانی
ئـەز سـل نـیـنـم ب گـــــــرانـی
دوســـــتێ من ئەڤــــرۆ گـــوتی
تـو خــــــــوینـا نـاڤ دلانـی

١٩٦٦

* ئەڤ هوزانە گولبهارێ گوتبی ل ١٩٦٧ێ.

## دەمێ پەزکیڤی دبنە هوزانڤان

ئەی چێکەرێ تالع و بەختـــان
بلندێ هەمی تاج وتەخـــتـــان

ئەی نوشـــدارێ ئێش و برینان
ئەی دەرمـــانێ دەرد و گــرینان

ئەی هوســتــایێ بلند ونزمــان
ئەســمـانێن بلند بێ هەلگرمـان

ئەی رێبەرێ ڤـان چاخ و جهـان
نە غـــافلێ هەتاڤ و ســـهــان

وەختێ تە مـروڤ دورست کـرن
تە ب پێ و ســەر ودەست کـرن

ته دوو چاڤ دان و ئێک زمـان
لـەو مـلـلـەت پـەیـدابـون ل دران

لێ بو ته دا وان تیر و کڤان..؟
ل وان بـار دکی بـارێ گـــران..؟

ئــەی زێــرنــگــرێ هــزر و ژیــرا
گـــەمی ڤـــانێ باوەو وبیـــرا

درها کـراسێ خـەجـا بێ کـەس
وێ دەرزی دڤـێتن نه مـەقـەس

ئەی دانـەرێ ئاڤ رویـێ مـێـران
ژێ برێ خـــورتیێ ژ شـــێــران

ئەی زانـایێ ژان و دەرمـــــانی
نـوژدارێ بـرینـا گــــــــرانی

تو ژ ســـیـــابەندرا بکی چارە
لێ نەگـــری کـــێم هزر و ژارە

تە دەستێ مرنێ دیرکربا
ژی یا با سیابەند ژییر ببا

زانی با چرا شاخ بلندن
هیڤی بلندن لەوا هندن

بلا نەمرت هێشتا گەنجە
دەم هوستایەکی گەلەک قەنجە

دێ دەمەک ئێتن دێ تێ گەهت
بەهشت بێ یی مە نابت بەهشت

ئەی سیبەرێ بێ کەس و ژاران
نوشدارێ ژانێن بریندااران

تو ساخ کی برینا ڤی لاوی
دەرکی کەلەمی ژ پشتاوی

بەلکو ئەو بژیتن سەر ژ نوی
بژیتن وەکو مێر نەبەنی

نەکـــوژتن دوست و هەڤـــالان
ســەر ژێ نەکــەتن مــەکــەوالان

شـەل و شـەپکێن وی ژێ هاتـینە
ژ هریـا بـەرانـان رســــتـــــینـە

خــودێ وۆ مــەزن و دل مــەندی
لێ نـەگـــری ڤی ســـیـــابەندی

* ئەڤ هوزانە ل دوماهی یا شانوگەریا من (دەمێ پەزکیڤی دبنە هوزانڤان) تێتە خاندن.

## هاوارەک بو خانی

سوتی یێ کوردانی دلۆ
ئەڤرۆ نە زیندانی دلۆ
سەربەستم کوردم ئازادم
تو ڤەژین کە خانی دلۆ

ڤەژین کە خانی ببینت
ملەتێ خۆ ل خۆ دهەلینت
ئالاێن ژینا سەرفەراز
ل جیهانێ دا دهەژینت

دا نەبێژن کو کورمانجین
بێ هیڤی ی و بێ ئارمانجین
سست و خاڤ و داکەتینە
یان بێ بنیاد و نەزان جین

دێ هلۆ ڤـــەژین بە خـــانی
بهـــایێ زانی یێ مـــەزانی
هـونـەر و زانـین دو چـەکـن
پێـــڤێ ێن رێکا کـــاروانی

کــــاروانێ رێکا ڤێ ژینێ
ســـۆرە رێکا وی ژ خـــوینێ
دا بگەهینت پاشــــەرۆژێ
پڕ ژ خـۆشی و تێـر ئەڤــینێ

خـــانی بێـــژە زین و مـــەمی
بهـــێلن ئازار و خــــەمی
نەوروزا ســـالا ڤێ ســـالێ
پێ گـــەهاند زینێ بۆ مـــەمی

گـەلی کـوردێن ڤێ جـڤـاتێ
هەلگرێن بیــــرا خــــەباتێ
چێکەرێن مــێــژوا بیـــران
پـێـش وەرێـن دیـرە ئـاواتـێ

ئەڤ زینە وەلاتێ مەیە
ئەڤ مەمە میللەتێ مەیە
میللەت و وەلات گەهشتن ئێک
یازدە سێ خەلاتێ مەیە

ئادار ١٩٧٠

# دەمێ خانما بار کر

**پێش کێشە بۆ بەهشتی یا نەمر رەوشەن بەدرخان**

خـــانما ئێش و زێمـــاران خـــاتونا دەردێ گـــران
شــەهزادا عــشــقــا وەلاتی رەوشــەمــالا بەدرخــان
زێرینـا پـەرێن هاوارێ تیــــروژا پـەیڤـــێن زەلال
رەوشـەنا مـیـرێ ئومـێـدان گـەوهەرا تاجێ سـەران

هەڤــالا مــیــرێ خــەباتان هەڤ ژی یا جــەلادەتی
تو ل بەر ئاڤــا کــوڤــانا شــەنکەبی بوی نەکــەتی
خـــانەدانا بنەمـــالان ئەڤـــرۆ شـــینی بو تەیە
شـــینی یا جـــەرگ و دلانە دلبـــەرا ڤی ملەتی

روح شـرینێ خـانمێ گـەر ب ئاسـمـانان تو كـەتی
خـۆش سـلاڤـان بگەهینە رێبـەرێ پـەیڤـا پـەتی
تو ژمـیـرێ پـەیڤـا بێـژە هێـشـتـا گـەشـدارە مـیـرو
«هاوارتە» خـوش ڤـەدابو خـۆش نڤـشـتـا زێرخـەتی

گـەر گـەهشـتی رەخ و دورێن مـیـرێ باكێ پر ئەڤین
ڤـەكـە ژێرا دل و جـەرگـان سـورەتا ئەنفـال بخـوین
ژێرا بێـژی خـانمامن ئەو ئومـێـدا هند ژمـێـژ
گـرتی یە ئەڤـرۆ خوناڤ ەك ئەم ژ كـەیفـا د گـرین

ئەم ل سـەر لوكـا مـیـری نە و كـوردی هەر بارێ مـەیە
ئێكە كـوردی و هەردێ مـینت كـوردینی كـارێ مـەیە
مـە ژ بل كـورمـانجی نینە ئەم ب كـوردی دپەیڤین
مـە ژ فـەرهەنگرا خـەباتە و كـوردی هەر زارێ مـەیە

خـانما عـشـقـا ئومـێـدان رەوشـەنا دەشت و چیـا
پاكی یا ئاڤـا سـیـلاڤـان هەوارە مـە ژ دل ڤـیـا
شـا ژن و تو مـیـرخـاتوینی نفش و نژادا مـیـدیا
لێ بەلێ ئەڤـــرو دیارە بەلگەك ژ دارێ وەریا
١٩٩٢

## مار ماسی

پەراسی ێن من
و هەمی هەستی ێن من
ئەڤ شەڤە
داگرتینە
گەلو تژی خەمن
هەمی رەزێن دلێ من
ئەڤ شەڤە
پێش چاڤێن من
تێن سۆتن
هەمی نهالێن جەرگێ من
ئەڤرۆ بریێن
هەمی کەهنی ێن ناڤ روحا من دزێن
وەلێ خۆیێن
هەمی خەیالێن ڤینا بەرێ

ئەڤ شەڤە
من دبن ومن تينن
من ژ رهارا دهەژينن
من نقۆ دكن
جاران..
وجاران دفرينن
گەلو نەستران
نە دەنكێ دهۆل و زرنان
نە دەنگ زراڤێن كچان
نە چاڤ بەلەكێن جانان
دشێن دلێ من خۆش بكن
دل بوانا ناڤەبت
پتر دئێشينن
ئەڤ شەڤە
وەک ماسی گرەكێ
شۆكا بيران
بەر ددم ناڤ دەريايا هزران
بەلكو شۆكا مە
هەيڤا مە
ژ بنێ ئاڤێ

بینته دەر
لێ شوک ژ بێ هیڤی یان
بی مار ماسی
مار ماسی یەکێ هار
بخو ڤەدا و مر
داڤ ما بتنێ
ل سەر لێڤا ئاڤێ
ژ ئێش و کوڤانی یێ
خو گلوله دکر
خو گلوله دکر...

١٩٨٦

# دلــــۆ

دلۆ بیـــرا ئەز ڤـــەکـــێـــشـــام
دیر برم ئەز کـــەلەک ئێـــشـــام

ئەز برم ناڤ مـــێـــرگـــو گـــولان
بشـــکوژێـــن ئومـــــــێـــــــدا دلان

دلـــۆ هـــیـــنـــگـــێ تـــو تـــۆلاز بـــوی
پر هیـــــڤـــی بۆوی تـــو پر نـــاز بـــوی

ژیـــان ل بـــەر تـــە رەنـــگـــین بـــو
خـــــەون وســـــتـــــران و ئەڤین بـــو

لـــێ دل دلـــۆ دلـــێ مـــنـــۆ
هەڤـــژی ی و هەڤـــالێ منۆ

كــــانێ ئەو بشـكـوژێـن بەلاڤ
كـا سـوسنێـن ژێ تێـن خـوناڤ

١٩٧٩

* گولبهارێ گوتبی١٩٨٢.

## سروودا زۆزانێ

زۆزانا ب سیسکو کەڤوکە      بــتڤیرک و کــەو پەپوکـە
بشــیلان و رحان و نێرگز      بشـــلێر گول نیســـانوکە

* * *

زۆزانــا هــین و بەفــــرینە      جهەکێ خـۆش و خەملیـنە
زۆزانا ب گــەلی و نهــالە      زێرینە و هەر دەم رەنـگینە

* * *

زۆزانــا ب نهــال و چیــا      ب چیمەن و نەفـەل و گیا
ناڤ مێرگ و دارێن چنارا      بەحــشتا دلــێ مــە ڤیــا

* * *

زۆزانــــا ژێهـــل چـــیانە      بەحشـــتە سەردا ئەسمانـە
کەپر و لیسێن مە بەلاڤن      جــهـەکێ نـوش و دەرمانـە

* * *

---

* گولبهارێ گوتبی ١٩٧٣.

# سروودا بادینا

**پێش کێشه بو هەمی بچیکێن سالا ئێکێ**
**ل فێرگەهێن سەرەتایی ل کوردستانی**

چـــۆم دهـۆکا داســــنا         شینوارێ سینگ ئاسنا
رەوشـــا دلـێ بادیـــنا        ناڤ نێرگز و ســـوســنا

* * *

چـــۆم ئامــێدیێ بلنـده         هنداڤ سیلاڤ و گونده
رەوشـــا دلـێ بادیـــنا        ســـحـار و رۆژ ئەلنـــده

* * *

چـۆم ئاکرەیێ ب چـیایه        بەحشـــته و خۆدێ دایه
رەوشـــا دلـێ بادیـــنا        وارێ پـــۆڕ و کـــەوایه

* * *

چۆم زاخـویێ ب خابیره        ب گـەلی و چیا و زیره
رەوشـــا دلـێ بادینا        پـــرا دەلالێ مـــیــره

١٩٧٠

# چومه دەستی*

چۆمە دەستی دا ب هژینم
چۆمە دەستی دا ببینم
دا سلاڤ کم پاشی روینم
هند من خۆ دیت ئەز ئەڤینم

کەت دلێ من هەر ژوێ گاڤێ
ئەو بشکڤی وەک حەتاڤێ
من ژێ وەرگرت خوش سلاڤێ
ئەو سلاڤا وەک گولاڤێ

گـەلەک نێـزیک ئەم روینشـــتین
ب دلێ ئێک دو تێگەهشـــتین
داخ و ئاخــــینـک هزار جـــارا
ئەڤین داری ئەمــێن کــوشـــتین

* گولبهارێ سالا ١٩٦٨گوتبی.

## فەهرەست



## هوزانڤان د چەند رێزان دا

* ل سالێن شێستا دەست ب نڤێسینا هوزانان کری یە.
* ل ١٩٧٩ێ دکتوراه ژ بریتانیا وەرگرتی یە
* ل ١٩٦٧ کتێبا (طبيعة المجتمع الكردي في أدبه) چاپ کری یە.
* ل ١٩٧٠ کوڤارا چیا بەرهەڤ و بەلاڤ کری یە کو ئێکەم کوڤارە ل پارێزگەها دهوکێ دەرکەفت.
* ل ١٩٨٠- ١٩٨٤ێ چار کتێبێن سایکولوجی و پەروەردەی چاپ کرینە کو پێوەندی ب پسپوریا وی یا ئاکادیمی هەین.
* ل ١٩٨٥ێ مەمێ ئالان وەرگێرا عەرەبی (کوپی یا روجر لیسکو).
* ل ١٩٨٩ێ کتێبا (الحكمة الكردية) چاپ کری یە.
* ل ١٩٩٨ێ کتێبا وی (مذكرات فؤاد عارف) هاتە چاپ کرن پێش گوتن و کومێنتا د. کمال مظهر.

* ل ٢٠٠٢ێ کـتـێـبـا (المجـتـمع الكردي في المنظور الاستشراقي) چاپ کری یه.
* ١٩٧٥ێ (براءة اختراع) وەرگرتی یە ژ بو ئامیرەت و رێکا فێرکرنا کورا خاندن و نڤێسینێ.
* ل ١٩٧٠ێ ببو سەروکێ نڤێسەرێن کوردا ل هەڤلێرێ.
* ل ١٩٧١ بەشداری ل ئێکەم مێهرەجانا هوزانێن کوردی ل کەرکوکێ کری یه.

## سوپاس

سوپاس بو ئەندامێن دەست گەها سپیرێزی برادەرێن هێژا و خوشتڤی: (رەبیع خەلاتی، مەسعود گولی، نزار رەشاد، بەیار جەمیل، شێروان ئەحمد)، ژ بو کارێ وانا یێ ژێ هاتی و پر ب دلسوزی کو ئەڤ دیوانە (زێمارا چیا) ئەڤرو ب ڤی رەنگی هاتە دورست کرن و پێک ئینان.

بەدرخان سندی

### تێبینی

رێنڤیسا ئەڤ دیوانە پێ هاتیە چاپکرن دگەل وان بنگەهێن رێنڤیسێ ناگونجیت یێن مە لبەرە ئەم د چاپەمەنییێن خۆ دا لبەر چاڤ بگرین. لێ رێزگرتن ژ بۆ داخوازا شاعری مە دەسکاری د رێنڤیسا وی دا نەکر.